# ئُيبن تەيميە

(٦٦١ك-٧٢٨ك/١٢٦٣ز-١٣٢٨ز)

## ڕەچەڵەك و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا

نووسینی:
نهاد جلال حبيب الله



ناوەندی ئەیوبی بۆ لێکۆڵینەوە فیکری و مێژوویی
ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەك و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا) نهاد جلال

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ئیبن تەیمیە ( ڕەچەڵەك و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا ).

نووسەر: نهاد جلال حبیب الله

چاپخانە: چاپخانەی

چاپ: یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز / سلێمانی

نرخ: ٣٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٦١٢ ی ساڵی ٢٠٠٩ز. وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.







بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً ﴾

الأحزاب٢٣

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا توێژینەوەیەکە خوێندکار ( نیهاد جەلال حەبیبوڵلا ) پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی کردووەلە ساڵی خوێندنی (٢٠٠٨-٢٠٠٩) ز. بە سەرپەرشتی بەڕێز د.صەلاح کانەبی و ئەندامانی لیژنەی گفتگۆو هەڵسەنگاندنیشی بەڕێزان د. عطا عبدالرحمن و د.شوان عوسمان بوون، وەك بەشێك لە پێداویستیەکانی بەدەستهێنانی پلەی بەکالۆریۆس لە مێژوودا، کە بە پلەی ( نایاب ) وەرگیراوە.





## سوپاس و پێزانین

❖ سوپاس و ستایشی پەروەردگارم دەکەم کە توانای بەکارخستنی بیر و پێنووسی پێبەخشیم تا ئەم لێکۆڵینەوە نەوازشیە ئامادە بکەم.
❖ سوپاس بۆ سەرپەرشتیاری بەڕێزی توێژینەوەکەم د.صەلاح کانەبی کە لە سەرەتاوە دڵسۆزانە یارمەتی دام.
❖ سوپاس بۆ ئەندامانی لیژنەی گفتگۆو هەڵسەنگاندنی ئەم توێژینەوەیە بەڕێزان د.عطا عبدالرحمن و دکتۆر شوان عوسمان.
❖ سوپاسی هەموو مامۆستایانی بەڕێزم دەکەم، کە هەر هەوڵێکی زانستیمان بەرهەمی ڕەنجی ئەوانە.
❖ سوپاس بۆ هاوڕێیانی بەڕێزم، هەموو ئەوانەی بە وشەیەك یان بزەیەکیش بێت یارمەتیدەر و هاندەرم بون.

## پێشکەشە

* بە دایکی ئازیزو دڵسۆزم کە بەرزترین هیواو ئامانجم گەشتنە بە ژێرپێیەکانی.

* بە باوکی خۆشەویستم کە بە ئارەقەی نێوچاوانی ئەم نەمامەی ئاوداوە تا بەری ڕەنجی دڵسۆزانەی خۆی ببینێتەوە.

* بە هەموو ئەوانەی لە کاروانی زانستدا خۆیان ناونووس کردووە.

* بەو کەسانەی تامەزرۆی مەیدانی توێژینەوەی مێژووین تا لەمڕۆی ژیانیاندا داهاتووی پێببینن.

* بە هەموو مامۆستایانی بەڕێزم کە لە سەرەتای ژیانمەوە لە بەخشینی پیتێکەوە تا ئەم ساتەش دەستبەردارم نەبون.

* بەوانەی تامەزرۆی دیداریانمو لێیان دوورم.



شاوەندی ئەیوبی بۆ لێکۆڵینەوەی فکری و مێژوویی
ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەك و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا) نهاد جلال

## هێما و کورتکردنەوەکان

| | |
|---|---|
| س.پ | سەرچاوەی پێشوو |
| ص | صحيفە |
| ل | لاپەڕە |
| هـ.س | هەمان سەرچاوە |
| ت | توفى |
| ك | کۆچی |
| ز | زاینی |
| ط | الطبعة |
| مج | مجلد |
| ج | جزء |
| چ | چاپ |
| د | دکتۆر |
| و | وەرگێڕان |

# پێڕست

**بابەت** — **لاپەڕە**

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خودای گەورە، صەلات و سەلامی خوای باڵادەست لە پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد و ئالوبەیت و یارانی.

کەسە کاراکانی ناو مێژووی مرۆڤایەتی ئەگەر تاکە هۆکاری ڕێکردەی مێژوویی نەبن، ئەوا هۆکاری یەکەمی ئەو گۆڕانە ڕیشەییانەن کە مێژوو بەخۆیەوە دیون، مێژووی ئیسلامیش پڕ لە گۆڕانی جۆراوجۆربووە، پشکێکی گەورەی ئەو گۆڕانەش بۆ زانایانی ناو جیهانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە.

ئیبن تەیمیەش یەکێکە لەو کەسانەو ئەو گۆڕانەی ئەنجامیدا گشتگیرو درێژخایەن و ڕیشەییش بوو، بەڵکوو تا ئەمڕۆش بەشێکی زۆری جیهانی ئیسلامی سەرقاڵی هزری ئەم کەسایەتیەن، وێڕای گرنگی تێڕامان لە هزری ئیبن تەیمیە لەلایەن جیهانی ڕۆژئاواوە، بۆیە بە باشمان زانی توێژینەوەیەك لەسەر ئەم زانایە بنووسین بە ناونیشانی (ئیبن تەیمیە ڕەچەڵەك و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا)، تا هەوڵێکی سەرەتایی بێت بۆ کاری باشتر لەم بوارەدا.

ئیبن تەیمیە یەکێکە لەو کەسایەتی و زانایانەی ناو مێژووی شارستانیەتی ئیسلامی کە بوو بە بنەڕەتێك تا خوێندنگەیەکی گەورە لە جیهانی ئیسلامیدا دروست بێت کە بە خوێندنگەی ئیبن







تەیمیە ناسراوە، ئەمەش وایکردووە هەر گەلەو بیدەنەوە پاڵ خۆیان، لە کاتێکدا چەندین بەڵگە هەن کە ئەوە دەسەلمێنن ئیبن تەیمیە کوردە، کەچی تا ئێستا ئیش لەسەر ئەوە نەکراوە، بەوهیوایەی ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکی سەرەتایی بێت لەو بوارەدا، لەم توێژینەوەیەشماندا ڕێبازێکی مێژوویی هزری شیکاری گیراوەتە بەر.

قسەکردنی ئێمە لەسەر کەسایەتیەکە کە لەنیوەی دووەمی سەدەی حەوتەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاوە و لەچەند لایەنێکی ئایینی و سیاسی و نووسین و هزریەوە ڕۆڵی دیاری خۆی بینیوە، بۆیە هەوڵ دەدەین بەکورتی قسە لەسەر گرنگترین لایەنەکانی ڕەوشی ئەو سەردەمە بکەین تا بتوانین لەوێوە لەکارو بڕیارو هەنگاوەکانی ئیبن تەیمیە بکۆڵینەوە، چونکە تا لە کاریگەری شاڵاوی سەربازی خاچی و جەنگی هزری جیهانی مەسیحی تێنەگەین، ناتوانین لە لایەنە پاڵنەرو کارتێکەرەکانی نووسینی وەك (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح) تێبگەین، یان کاریگەری شیعەو دەستەی ئیسماعیلیەو ڕۆڵی مەزهەبە شیعیەکان وای لێدەکات پەرچەکرداری هەبێت و کتێبی وەك (منهاج السنة النبوية) بنووسێت، کارابوونی ڕۆڵی فەلسەفەو بڵاوبوونەوەی مەنتیق و کەلامیش وا لە ئیبن تەیمیە دەکات نووسینی وەك (الرد على المنطقيين)ی هەبێت، هاوکات نووسینی وەك (العقيدة الواسطية) لە بواری بیروباوەڕداو

لەناوبردنی چەند دیاردەیەکی ناو کۆمەڵگە لەگەڵ خوێندکارەکانیدا لە کاریگەری شلۆقبوونی باری بیروباوەڕی ئەو سەردەمەوە بووە، ئەمانە وامان لێدەکات هەوڵبدەین پێشتر شارەزاییەك لەڕەوشی سەردەمەکەی پەیدا بکەین.

ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکەش لە سێ بەش پێکهاتووە:

لە بەشی یەکەمدا باسی ڕەوشی جیهانی ئیسلامی لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمدا کراوە، چونکەبەدڵنیاییەوە ڕەوشی سەردەمەکەی خۆی کاریگەری هەبووە لەسەر دروستبوون و کارابوونی فرەلایەنەی ئەو کەسایەتیە، چونکە ئیبن تەیمیە ویستویتی گۆڕان لەو بارودۆخەی خۆیدابکات، خودی ئەو کەسایەتیەیش زادەی بارودۆخی ئەو سەردەمەیە و خوێندنەوەی وردیشی بۆ سەردەمەکەی یاریدەدەرو ڕێخۆشکەربوو بۆ دروستکردنی گۆڕانێکی لەوجۆرە.

لەباسی یەکەمدا ڕەوشی سیاسی و سەربازیمان باسکردووە، باسی دووەم تایبەتە بە بارودۆخی ئاینیەوە، لە باسی سێیەمدا قسە کراوە لەسەر لایەنی ژیاری و زانستی، لە باسی چوارەمیشدا ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتیمان خستوەتەڕوو.

بەشی دووەمیش باس لە ڕەچەڵەکی ئیبن تەیمیە و ژیانی تا مردنی و بەرهەمەکانی دەکات:

لە باسی یەکەمدا قسە لەسەر لەدایکبوونی و ڕەچەڵەکی و بنەماڵەکەی کراوە، باسی دووەم لە سەر ژیانی زانستخوازی ئیبن





تەیمیە چووە، باسی سێیەم تایبەتە بە گرتنەکانی و بەندکردنەکانی، باسی چوارەمیش مردن و وتەی ناوداران لەسەر دێنێت، باسی پێنجەمیشی بەرهەمەکانی و تایبەتمەندییان دەخاتە بەرچاو.

بەشی سێیەم قسەکردنە لەسەر ڕۆڵ و کاریگەری ئیبن تەیمیە لە مێژووی ئیسلامیدا، لە باسی یەکەمدا ڕۆڵی جیهادیەکەی دەخەینەڕوو، لە باسی دووەمدا ڕۆڵی چاکسازی چەند لایەنەی ئیبن تەیمیە هێنراوە، باسی سێیەم قسەکردنە لەسەر کاریگەری هزری ئیبن تەیمیە لەدوای خۆی، باسی چوارەمیش دیدی ئیبن تەیمیە بۆ مێژوو دەخاتەڕوو، باسی پێنجەمیش ڕوانگەی هەواداری و نەیاری لەڕووی ئیبن تەیمیەدا دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

لەم توێژینەوەدا چەندین سەرچاوە بە زمانەکانی عەرەبی و کوردی و فارسی بەکارهێنراوە، لە دیارترینیشیان بریتین لە: ( ابن عبدالوهاب: العقود الدرية فی مناقب شيخ الأسلام ابن تيمية، إسلام بن عيسى الحسامی: سيرة شيخ الإسلام ابن تيمية وحكاياته مع أبناء زمانه، محمد أبوزهره: ابن تيميه، أبوالحسن الندوی: رجال الفكر والدعوه) و چەندین سەرچاوەی دیکە.

ئەوەی لەم کارەدا گرفتی بەرچاو بوو، بیریتیبوو لە بەرفراوانی سنووری هزری ئیبن تەیمیە و زۆری بەرهەمە هزریەکانی، هەروەها

**پەرشوبڵاوی زانیاریەکان لە سەرچاوەکاندا، وێڕای ڕاجیاوازیەکی زۆر لەسەر خودی ئیبن تەیمیە.**

**شتێکی ڕوونە هیچ کارێك بەبێ کەموکورتی نابێت چونکە مرۆڤەکان شیاوی هەڵەن، بە تایبەت نووسین لەسەر کەسایەتیەکی وەك ئیبن تەیمیە کە تا ئەمڕۆش ڕاجیاوازیەکی پەرگیری توندی لەسەرە.**

**بەو هیوایەی ئەم هەوڵە نەوازشیە توانیبێتی کونجێکی ئەو ڕووبەرە فراوانە بگرێتەوەو سەرەتایەکیش بێت بۆ هەوڵی دواتر.**

**نهاد جلال حبيب الله**
nihadhawramany@maktoob.com





# بەشی یەکەم

## باروودۆخی جیهانی ئیسلامی لەسەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا

کە خوارزمشاه* دەیویست دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە بەغداد بگرێت.[٣]

هەروەها مەغۆڵەکانیش* بەسەرکردایەتی جەنگیزخان یەکڕیزییان بەدەستهێناو کەوتنە فراوانخوازی و ناوچەکانی چینیان گرت‌و دەسەڵاتە لاوەکیەکانی دەوروبەریان داماڵین، ئینجا ڕوویانکردە جیهانی ئیسلامی‌و توانییان دەسەڵاتی خوارزمیەکان بڕووخێنن،[٤]

* ناوی سوڵتان عەلائەدین موحەممەد خوارزمشاهە کە لە ساڵی ٥٩٦ ك.دادەسەڵاتی دەوڵەتی خوارزمی گرتەدەست‌و لە سەردەمی خەلیفە ناسر لیدینیلاهی عەبباسیدا ویستی بەغداد بگرێت، دواتر لەساڵی ٦١٧ك. و لەبارێکی نائاساییدا مرد. (بروانە: الصیاد، س.پ، ل٧٠، ١٤٢،٧٨).

٣- أبوشامة: الذیل علی الروضتین، ط١، دار الکتب العلمیة، (بیروت/٢٠٠٢م)، مج٣، ج٥، ص١٥٣-١٥٥.

* مەغۆڵەکان دووهۆزبوون لە هۆزە تەتەرە تورکەکان کە لەبیابانی جوبی دەژیان‌و خێڵێکی‌و کۆچەری‌و فرەئاییین‌و بەهێزبوون‌و لەسەر دەستی جەنگیزخان یەکیانگرت‌و هێرشیان بردەسەر چین‌و دەوروبەریان‌و جیهانی ئیسلامی‌و لەماوەیەکی کەمدا ئیمپراتۆریەتێکیان دامەزراند. (بڕوانە: حسن أبراهیم حسن: تأریخ الأسلام، ط١٥، دارالجیل، (بیروت/٢٠٠١م)، ج٤، ص١٢٥، ١٢٧، ١٢٨، ١٣١، ١٤٠).

٤- أبی الفداء: المختصر فی أخبار البشر، ط١، دارالکتب العلمیة، (بیروت،١٩٩٧م)، ج٢،ص٢٨٠؛ السیوطی: تاریخ الخلفاء، دارالکتاب العربی، (بیروت/٢٠٠٦)، ص٣٥٩.







کوشتن و بڕین وبەدیلگرتن‌و فرۆشتنی وەك کۆیلەیان لەڕوودا بەکارهێنان، تەنانەت موزەفەر قوتز* کە دواتر دەبێتە ڕووخێنەریان دیلی ئەمانەو بەکۆیلە دەفرۆشرێت و دواتر بڕیاری تۆڵە سەندنەوە دەدات.[٥]

بەغداد پایتەختی خیلافەتی عەبباسی بوو، دەسەڵاتی عەبباسی دوای هاتنی تورکەکان لەسەردەمی موعتەسەمەوە (٢١٨ك-٢٢٧ك/٨٣٣ ز-٨٤١ ز) ودواتر هاتنی بوەیهیەکان (٣٣٤ك-٤٤٧ ك/٩٤٥ ز-١٠٥٥ز)و پاشانیش سەلجووقیەکان لەساڵی(٤٤٧ك-٦٥٦ ك/١٠٥٥ز-١٢٥٨ز) دەسەڵاتی سیاسی خۆی لەدەست دابوو ولەسەرەتاکانی سەدەی حەوتەمەوە بەرەو ئەوە دەچوو ئەو سەربەخۆییەی دەستکەوێتەوە،[٦] هاوکات سەلجووقیەکانی ڕۆم لە ئاسیای بچووك بەرەو بارێکی لاوازی و بەرەو دارمان دەچوون.[٧]

* قوتزی کوڕی عەبدوڵلا سەرکردەی مەملووکیەکان بوو و توانی لە ساڵی ٦٥٦ك/ لە جەنگی عەین جالووتدا مەغۆلەکان بشکێنێت، دواتر لەسەر دەستی زاهیر بیبرسی هاوڕێی لە شانزەی ذیلقەعدەی هەمان ساڵدا کوژرا. (الصفدی: فوات الوفیات، دار أحیا و التراپ، (بیروت/٢٠٠٠م)، ج٢٤، ص١٨٩-١٩٠).

٥- أحمد مختار العبادی: فی تأریخ الأیوبیین والممالیك، دار النهضة العربیة، (بیروت/١٩٩٥)، ص١٣٢.

٦- طقوش: س.پ،ل ٢٤٦.

٧- طقوش: تأریخ سلاجقة الروم فی اسیا الصغری، ط١، دار النفائس، (بیروت/٢٠٠٢م)، ص٢٧٥-٣٠٦.

لە میسرو شامیشدا ئەییووبیەکان دەسەڵاتیان لەدەست دابوو، بەڵام بەهۆی ناکۆکی نێوان خۆیان و دواتر بەرەو لاوازی چوونیان دەسەڵاتی خۆیان لە میسر لەدەستداو مەمالیکەکان شوێنیان گرتنەوە،[٨] ئینجا مەمالیکەکان هەوڵیاندا شەرعیەت بە دەسەڵاتی خۆیان بدەن و چەند ڕێگەیەکیان گرتەبەر، لەگەڵ ئەوەشدا کەوتنە ململانێیەکی سەختی دژ بە بنەماڵەی ئەییوبی لەشامداو دژبەیەك چەند جەنگێکیان ئەنجامدا تا دواتر خەلیفە موستەعسەمی* عەبباسی ڕێککەوتنی لە نێوانیاندا بەست.[٩]

لە ڕۆژئاوای ئیسلامیشدا، ململانێی موسڵمانان و خاچیەکانی ئەورووپا لەلایەك و ململانێی ناوخۆیی خۆیان لەلایەکی ترەوە هەبوو،[١٠] تا دەوڵەتی موەحیدین خیلافەتی نوێی ڕاگەیاندو دواتر حەفسیەکان هاتن.[١١]

[٨] أبوالفداء: س.پ، ج٢، ل٢٨٧، ٢٨٨.
* ناوی عەبدوڵلای کوڕی مەنسوورەو لە ساڵی٦٠٩ك. لەدایکبووەو لە ساڵی ٦٣٢ك. بووە بە خەلیفەی عەبباسی و ماوەی دەسەڵاتەکەی زۆر شلۆق بووەو خۆیشی وەك باوکی وریاو بەهێز نەبووە، لە ساڵی ٦٥٦ك. دا بەدەستی مەغۆلەکان کوژراوە. (الصفدی: س.پ، ج١٧، ل٣٤٣).
[٩] ه.س، ج٢، ل ٢٩٣.
[١٠] علی محمد الصلابی: تأریخ دولتی المرابطین و الموحدین، ط٢، دارالمعرفة، (بیروت/٢٠٠٥م)، ص٩١-١١٩، ٢٣٥ ، ٥٢٤-٥٢٥.
[١١] أبوالفداء: س.پ، ج٢، ل٢٩٤-٢٩٥؛ الصلابی، س.پ، ل٥٠٧، ٥١٢-٥١٣.





لەناو جیهانی ئیسلامیشدا دەستەی ئیسماعیلی باتینی* ڕۆڵێکی کاراو دیاریان دەنواند، ئەمانە ببوونە مایەی لاوازکردنی دەسەڵاتی ئیسلامی و هەر لەسەردەمی بوەیهیەکانەوە دەرکەوتن تا ئەوەی لەسەر دەستی هۆلاکۆی مەغۆلی گورزێکی توندیان ئاڕاستەکرا[١٢].

لەم ماوەیەدا جیهانی ئیسلامی ئەم گرفتانەی بە خۆیەوە دەبینی، شاڵاوی خاچی و مەغۆلی و ململانێی ناوخۆیی:[١٣]

١- **شاڵاوی خاچی:** خاچیەکان لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا گرنگی خۆیان بە شاڵاوەکانیان دەدا بۆسەر جیهانی ئیسلامی،[١٤] شاڵاوبردنی مەسیحیەتیش لە سێ لاوە بوو:

١- **ڕۆژئاوای ئیسلامی:** جەنگی درێژخایەنی پێشووی ئەندەلوس و باکووری ئەفریقیای دەگرتەوە.[١٥]

* - ئیسماعیلیەکان دەستەیەکی ناو شیعەکانن کە بڕوایان بە پێشەوایەتی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق هەبوو، دیارترین نازناویشیان باتینیە بوو، باتینیەکانیش بە خۆیان دەوت ئیسماعیلی و لە ژێر کاریگەری فەلسەفەدا بوون. (الشهرستانی: الملل و النحل، ط٨، دار المعرفة، (بیروت:٢٠٠١م). ج١، ل٢٢٦-٢٣٠.
[١٢] الصیاد: س.پ.، ل٢٦٨-٢٨٦).
[١٣] محمدأبوزهرة: ابن تیمیة، دارالفكر العربي، (القاهرة:٢٠٠٠م)، ص١٠٣.
[١٤] أبوشامة: س.پ، مج٣ج٥، ص٢٨١،٢٦١؛ طقوش: تأریخ الممالیك في مصر و بلادالشام، ط٢، دارالنفائس، (بیروت/١٩٩٩م)، ص٢٨، ٢٩، ٣٧.
[١٥] - الصلابی: س.پ،٨٩، ٩٢، ،٣٧٤، ٤٦٠، ٤٦٣،٤٨٨؛ محمد خضری بك: چەند وانەیەك لەمێژووی ئیسلامی، و: نهادجلال حبیب الله، چاپی یەکەم، کتێبخانەی نارین( هەولێر/٢٠٠٨م)، ص٨٩-٩٤.

**٢- شام:** ئەمە پێشینەیەکی دێرینی هەبوو، هەرلە هەوڵەکانی ئولب ئەرسەلان(٤٥٥ك-٤٦٥ك/١٠٦٣ز-١٠٧٣ز) دژ بە مەسیحیە هێرشبەرەکان لە شام[16] تا جەنگی حتین(٥٨٣ك.) بە سەرکردایەتی سەلاحەدینی ئەییوبی(٥٦٧ك-٥٨٩ك/١١٧١ز-١١٩٣ز)[17]، بەڵام ئەم ململانێ و جەنگە کۆتایی نەهات، لەبەرئەوەی چەند میرنشینێکی خاچی مابوونەوە( روها، ئەنتاکیە، بەیتولمەقدیس)و لەنێوان جەنگ و ڕێککەوتندا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا دەبردەسەر[18].

**٣- میسر:** ئەم هەڵمەتە بەسەرکردایەتی لویسی نۆیەم ئەنجامدرا کە دواجار لەسەردەستی مەمالیکەکان شکستیان خوارد و قۆناغێکی هەڵمەتە خاچییەکان لەو ماوەیەدا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا و شکا[19].

[16] الذهبي: تأريخ الأسلام، ط١، دار الكتاب العربي، بيروت -١٩٨٧م)، ج٣١، ل١١-١٣؛ ابن كثير: س.پ، مج٦، ج١٢،ل١١٥

[17] أبوشامة: س.پ ، ج ٣، ل١٧٧؛ ابن الأثير: الكامل في التأريخ، دارالكتاب العربي، (بيروت/٢٠٠٦م)، ج١٠ص ١٠١ ، ١٠٢؛ أبو الفداء: س.پ، ج٢، ل١٥٨-١٦١؛ ابن كثير: س.پ، ج١٢، ل٣٥٩-٣٦٠.

[18] - طقوش: تأريخ المماليك، ل١١٦-١٢٩.

[19] أبوشامة: س.پ، مج٣، ج٥، ل٢٨٣؛ أبو الفداء: س.پ، ج٢، ل٢٨٧؛ طقوش: تأريخ المماليك، ل٣٧-٣٩؛ عادل زيتون:تاريخ المماليك ط٥، جامعة دمشق، ص٣-٧.







سوڵتان بیبرس* بەرامبەر بە میرنشینە خاچیەکان توندی نواند و توانی ڕیشەی چەندین ساڵەیان بخاتە بەر ئەگەری نەمانی یەکجارەکی، بەڵکوو خاچیەکان زۆر لێی دەترسان و ڕۆژی مردنی ئەویشیان بە ئاهەنگ گێڕا.[20]

**٢- شاڵاوی مەغۆلی:**

مەغۆلەکان کەبەسەرکردایەتی جەنگیزخان کۆبوونەوە لەگەڵ چینیەکاندا لەجەنگدابوون، بەڵام بەهێزبوونیان و هاندەری دەرەکی و هەڵەی خوارزمیەکان وای لێکردن ڕووبکەنە جیهانی ئیسلامی و درێژەیان بە شاڵاوی خۆیاندا تاگەیشتنەبەغداد، لەڕێگەشیاندا کوشتوبڕو وێرانیەکی زۆریان ئەنجامدەدا.[21]

* بیبرسی کوڕی عەبدوڵلا لە ساڵی ٦٢٥ك. لە قبجاق لەدایکبووە، پاش بەدیلگیرانی و کردنی بە مەملووک لە میسردا ناووناوبانگی دەرکرد، لە جەنگی عەین جالەتدا ڕۆڵێکی دیاری بینی، دوای سوڵتان قوتز بوو بە سەرکردەی مەمالیکەکان و جیهانی ئیسلامیش، توانی جیهانی ئیسلامی بەروە بەهێزی بباتەوە، لە ساڵی٦٧٦ك.دا مرد. (الصفدي: ج١٠، ص٢٠٧-٢١١).

[20] - أستيون رانسيمان: تأريخ جنگهای صليبي، ترجمه: منوچهر كاشف، چ٦، انتشارات علمي و فرهنگي، (تهران:٢٠٠٧م)، ج٣، ص٣٧٧-٣٩٠، ٤٦٢.

[21] السيوطي: س.پ، ٣٥٨-٣٦١؛ الصياد: س.پ، ل١٢٦-١٥٦.

لەساڵی(٦٥٦ك/١٢٥٨ز) دا مەغۆلەکان بەسەرکردایەتی هۆلاگۆ بەهۆی زۆری و یەکدەنگی و بەهێزی سوپاکەیان و یارمەتی ئیبنولعەلقەمی و لاوازی خەلیفەو خیلافەت و دووبەرەکی موسڵمانانەوە، توانییان بەغداد داگیربکەن و کوشتارێکی زۆریان تیادا ئەنجامداو گورزێکی سەختیان لە زانست و ژیاری ئیسلامی وەشاند.[٢٢]

ئینجا ڕوویانکردە شام و زۆرێکیان لێ داگیرکرد،[٢٣] بەڵام لەجەنگی عەین جالووتدا(٦٥٨ك/١٢٦٠ز) مەغۆلەکان لەبەردەم مەمالیکەکاندا شکستیانخوارد، بەمە ئەو ئەندێشەو تێڕوانینە نەما کە پێی وابوو مەغۆلەکان شکست ناخۆن.[٢٤]

مەغۆلەکان پێشتر لەنێوان خۆیاندا دابەشببوون، چونکە ئەوان کە هاتن خاوەنی ژیارو ئایینێکی سەرەکی خۆیان نەبوون، بۆیە لەبەردەم ململانێی ژیاروئایینی ئیسلامی و هەوڵی

---

[٢٢] ابن كثير: س.پ، ج١٣، ل٢٠٧-٢١٣؛ السيوطي: س.پ، ل٣٦٠؛ حسن ابراهيم حسن: س.پ، ج٤، ل١٤٧-١٥٥.

[٢٣] أبوشامة: س.پ، مج٣، ج٥، ل٣١١؛ المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٧م)، ج١، ص٥٠٩.

[٢٤] أبوشامة: س.پ، مج٣، ج٥، ل ٣١٧؛ الذهبي: س.پ، ج٤٨، ل٦١؛ ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٣، ل ٢٢٧-٢٣٠؛ السيوطي: س.پ، ل٣٦٣؛ الحنبلي: شذرات الذهب، ط١، دارالكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٨، ج٥ص٤٢٥.





مەسیحیکردنیان لەلایەن جیهانی مەسیحیەوە بارەکەیان گۆڕاو لە کۆتاییدا هەندێکیان هاتنە ناو ئایینی ئیسلام،[٢٥] بەم هۆیەوە بوون بەدۆستی مەمالیکەکان دژ بەو مەغۆلانەی تر کە موسڵمان نەببوون،[٢٦] هەرچەندە موسڵمانبوونی ئەوانیش لەسەر بنەمایەکی مەغۆلی بوو نەوەك لەسەر بنەڕەتەکانی شەریعەتی ئیسلام، بۆیە دواتر زانایانی ئیسلام لەدژیان دەوەستن و لەگەڵ مەمالیکەکانیشدا پێکدادەدەن.[٢٧]

### ٣- ململانێی ناو جیهانی ئیسلامی:

لەسەدەی شەشەمدا ململانێی قورسی نێوان ئەیووبی و مەمالیکەکان لەلایەك و نێوان خوارزم و خیلافەت و سەلجووقی لەلایەکی ترو ململانێی ئیسماعیلیەکان و دەسەڵاتە سوننیەکان یان ململانێی دەسەڵاتە سیاسیەکانی شیعەو سوننەو ململانێی موسڵمانان لەڕۆژئاوای ئیسلامیدا دیارترین خەسڵەتە سیاسیەکانی ناو جیهانی ئیسلامی بوون.[٢٨]

---

[٢٥]- الصياد: س.پ، ل٣٩١؛ محمود شاكر: التأريخ الأسلامي، ط٥، المكتب الأسلامي، بيروت-دمشق-عمان، ٢٠٠٠، ج٧ص٥٣،٤٨؛ طقوش: تأريخ المماليك، ل١١١.

[٢٦]- شاكر: س.پ، ج٧، ل٤٨؛ طقوش: تأريخ الماليك، ل١١١.

[٢٧]- شاكر: س.پ، ج٧، ل٥٥؛ اسلام بن عيسى الحسامي: سيرة شيخ الأسلام ابن تيمية، ط١، دار ابن كثير، (عمان/٢٠٠٦م)، ص١٩٠.

[٢٨]- محمد خضرى بك: س.پ، ل ٨٩، ٩٣، ٩٦، ٩٨، ١٠١، ١٨٦-١٨٨.

بەڵام لەئەنجامی شاڵاوی مەغۆلیدا هەریەك لەخوارزمیو ئیسماعیلیەكانو خیلافەتی عەبباسی نەمان[29] و سەلجووقیەكانیش بەرەونەمان دەچوون،[30] لەئەنجامی ململانێی مەمالیكو ئەییووبیشدا ئەییوبیەكان نەمان، بەمە سەركردایەتی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لەدەست مەمالیكەكاندا مایەوە،[31] لە ڕۆژئاوای ئیسلامیش دەوڵەتی موەحیدین و دوای ئەوانیش حەفسیەكان سەركردایەتی ڕەوتی ئیسلامییان گرتبووەدەست.[32]

ململانێی سیاسی ناو مەمالیكەكانیش خۆی لە پاشماوەی ئەییوبیەكانو شۆڕشی عەرەبەكاندا دەبینیەوە تائەوەی مەمالیكەكان بەسەر ئەو گرفتانەدا زاڵبوونو دەسەڵاتی خۆیان بەتەواوەتی چەسپاند،[33] ئینجا ململانێی سیاسی نێوان خۆیان بەزەقی خۆی نواند، لەگەڵ ئەوەی لەكاتی هەڕەشەی دەرەكیدا یەكیان دەگرتەوە،[34] تائەوەی لەسەردەمی ناسری سێیەمدا (٦٩٣-٧٤١ك/١٢٩٤ز-١٣٤٠ز) كە هاوسەردەمی ئیبن تەیمیەیە جۆرە سەقامگیریەكی بەخۆیەوەدی، بەڵام ئەمەش لە جاری سێیەمی دەسەڵات وەرگرتنەكەیدابوو.[35]

---

[29] – الصیاد: س.پ، ل١٢٦-١٥٨، ٢٧١-٢٩٥،٢٨٦-٣١٤،

[30]– أبوالفداء: س.پ، ج٢، ل٢٧؛ طقوش: سلاجقة الروم فی اسیا الصغری، ط١، دار النفائس، (بیروت/٢٠٠٢م)، ص ٢٨٣-٢٨٨.

[31]– زیتون: س.پ، ل٢٣؛ طقوش: تأریخ المالیك، ل٨١ ،٨٢.

[32]– شاكر: س.پ، ج٧، ل٤٦" الصلابی: س.پ، ل٢٤٨ ،٥٠٨.

[33]– طقوش: تأریخ الممالیك، ل١٠٦،٩٢.

[34]– العبادی: س.پ، ل١٣٧.

[35]– ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل ٥٣-١٩١.





# باسی دووەم
## ( ڕەوشی ئایینی )

سەردەمی ژیانی ئیبن تەیمیە، سەردەمی دەوڵەتی مەملووكیەكانە لە میسروشامدا، هاوكات بەشێوەیەكی ڕەمزیش خیلافەتی عەبباسی بووژێنرایەوە،[36] لەم دەوڵەتەدا ئایینی ئیسلام ئایینی ڕەسمی بووو دەوڵەتەكەش دەوڵەتێكی ئیسلامی سوننە مەزهەب بوو[37].

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بیروباوەڕی تر بەدیدەكرا كە پەرستگای خۆیان هەبوو كە ڕێوڕەسمەكانی ئەو ئایینانەی تێدا ئەنجامدەدرا،[38]

مەزهەبەكانی ناو ئیسلامیش جگە لە ئەهلی سوننەوجەماعە هەبوون وەك شیعەو سۆفیو ...هتد.[39]

---

[36]– أبوشامة: س.پ، مج٣، ج٥، ل٣٢٦،٣٢٥؛ أبوالفداء: س.پ، ج٢، ل٣٢٣؛ ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٣، ل٢٣٩" السیوطی: س.پ، ل٣٦٥؛ الحنبلی: س.پ، ج٥، ل٤٣٣؛ زیتون: س.پ، ل٢٩.

[37]– أدواردبروی: تأریخ الحضارات العام(القرون الوسطی)، اشراف: موریس كروزیە، عویدات، بیروت، ج٣، ص٥٥٢.

[38]– قاسم عبده قاسم: عصر سلاطین الممالیك، ط١، دارالشروق، (القاهرة/١٩٩٤م)، ص١٢٠-١٢٥.

[39]– أبو الحسن الندوی: رجال الفكروالدعوة، ط٣، دار ابن كثیر، (بیروت/٢٠٠٧م)، ج٢ص ٤٢٥-٤٣٢؛ زیتون: س.پ، ص١٦٣.

ئایینەکانیش بریتیبوون لە ئیسلامو مەسیحیەتو جوولەکە،[٤٠] هەرچی مەسیحیەتە لەوکاتەدا جەنگی سەختی دژبە ئیسلام و موسڵمانانی ئەنجامدەدا، ئەو جەنگەش لەدوو بواری گرنگی سەربازیو بیروباوەڕیدا بوو.

سەبارەت بە لایەنی هزریو بیروباوەڕی، مەسیحیەکان دەیانویست لەلایەکەوە بکەونە هەڵمەتی بەمەسیحیکردنو گومان دروستکردن لەسەر ڕاستیو ناڕاستی ئیسلام، لەلایەکی تریشەوە بە بوارە فەلسەفیەکان بەرامبەر بە ئیسلام بوەستن یان هیچ نەبێت شێواویەکی پیێ ببەخشن، هەر ئەمەیش بوو وای لە ئیبن تەیمیە کرد نووسینو لێدوانی ڕەخنەگرانەو دژایەتی لەڕوویاندا هەبێت وەك نووسینی کتێبی( الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح).[٤١]

سەبارەت بە ڕوانگە کرداریەکەیشی خۆی لە جەنگی خاچییدا دەبینیەوە کە ئەو جەنگە لەلایەن پاپاوە بەجەنگێکی پیرۆز دانراو ڕەنگێکی ئاینی بەسەردا سەپێنراو سەربازانیش بەزۆری بەهاندەری ئاینی و پاشان مرامی ئابووریو سیاسیش بەشدارییان تێدادەکرد.[٤٢]

[٤٠]- قاسم عبده قاسم: س.پ، ل١٢٠-١٢٣
[٤١] - أبوزهرة: س.پ، ل٤١٠-٤١١.
[٤٢]- محمدرضا القهوجي: حاضر العالم الأسلامی، ط٢، دارالکلم الطيب، (دمشق-بيروت/٢٠٠٤م)، ص ٧٠.







جوولەکەکانیش لە لایەنی سەربازیدا بەشدارییان نەدەکرد، بەڵکوو وەك کەمینەیەك لەناو جیهانی ئیسلامیدا دەژیان، جوولەکەکان لەڕۆژئاوای مەسیحیشدا کەمینە بوون، بەڵکوو مەسیحیەت فشاری لەسەرجوولەکەکان دانا تائەوەی کۆچیانکرد بۆ جیهانی ئیسلامی.[٤٣]

ئەوان زیاتر بەشداری ژیانی ئابوورییان دەکردو ئایینی خۆیشیان دەپاراست، بەو پێیەش مەترسییان بۆسەر جیهانی ئیسلامی کەمبوو بۆیە نابینین بەجۆرێکی وا بەرنگاربوونەوەی دیار لەنێوان جوولەکەو موسڵمانان لەو قۆناغەدا هەبێت، بەڵکوو ئەوان هەوڵیاندەدا لەڕێگەی دیبلۆماسیەوە هەنگاو بنێنو زیاتر ڕێگەی گفتگۆیان هەڵبژاردبوو، نموونەش بۆ ئەوە مشتومڕی نێوان ئیبن تەیمیەو جوولەکەکان بوو لەسەر دەقێکی بەڵگەنامەیی.[٤٤]

سەبارەت بە بواری ئایینی ناوخۆی موسڵمانانیش، بەسەر چەند مەزهەبێکی وەك سوننەو شیعەو سۆفیو موعتەزیلەو...هتد دا دابەشببوو، بەسوننەکان دەسەڵاتیان لەدەستدابووو لەچوار

[٤٣] علي حسون: تأريخ الدولة العثمانية، ط٤، المكتب الاسلامي،(بيروت/٢٠٠٢م)، ص٢٤١.
[٤٤]- الحسامي: س.پ، ل١٠١-١٠٢.

مەزهەب پێکدەهاتن کە بریتیبوون لە مەزهەبی مالیکی و حەنەفی و شافیعی و حەنبەلی،[٤٥] ئەمانە بەهۆی بارو ئەزموونێکی پێشوویانەوە لە ململانێیەکی سەختدابوون،[٤٦] دەسەڵاتیش زیاتر لای حەنەفی و مالیکیەکان بوو، هەرچی حەنبەلیەکانن لە دەسەڵات کەنار خرابوون بەتایبەت لەمیسردا، تاهاتنی سوڵتان بیبرس (٦٥٨-٦٧٦ك/١٢٦٠ز-١٢٧٧ز) کە بایەخی بە هەرچوار مەزهەبەکەداو هەریەکێکیان دادوەرێکی بە کۆمەڵێك دەسەڵاتەوە هەبوو،[٤٧] هاوکات کۆمەڵە زانایەکیش لەو سەردەمەدا ڕۆڵیان لەوەدا بینی، یەکێك لەوانە ئیبن تەیمیە بوو کە لەگەڵ ئەوەی سەربە مەزهەبی حەنبەلی ئەژمارد دەکرا بەڵام ئەو لە سنووری مەزهەبیدا نەدەوەستا.[٤٨]

سوننە مەزهەبەکان دەسەڵاتەکانی وڵاتیان لەدەستدابوو، کۆمەڵگەش بەگشتی سوننە مەزهەب بوو، بەتایبەت دوای ڕووخانی فاتیمیەکان (٢٩٧-٥٦٧ك/٩١٠ز-١١٧١ز) لە میسر مۆرکی شیعەگەری کەمکرایەوەو مەزهەبی سوننە لەسەر دەستی

[٤٥] - محمد خضری بك: س.پ، ل١٩٢.

[٤٦] - أبوالحسن الندوی: س.پ، ج٢، ل٤٣٢.

[٤٧] - محمد خضري بك: س.پ، ل ١٩٢.

٤٨- محمد رشادسالم: مقارنة بين الغزالي و ابن تيمية، دارالقلم، (الكويت/١٩٩٢م)، ص٢٤.





سەلاحەدینی ئەییوبی شوێنی گرتەوە،[٤٩] بۆیە زانایانی ئەهلی سوننە لەکۆمەڵگەدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو، نمونەش بۆ ئەوە ڕۆڵی عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلامە(٥٧٧ك-٦٦٠ك/١١٨١ز-١٢٦٢ز).[٥٠]

هاوکات جارجار ململانێی نێوان سوڵتان و زانایانی سوننە سەریهەڵدەدا وەك ناکۆکی نێوان ئیمامی نەوەوی (٦٣١ك -٦٧٦ك /١٢٣٣ز-١٢٧٧ز) و سوڵتان بیبرس (٦٥٨ك -٦٧٦ك /١٢٦٠-١٢٧٧ز) کە ململانێی دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی نیشاندەدا.[٥١]

دواتر مەزهەبی شیعە بە پلەی دووەم دەهات کە ڕۆڵی بانگەوازییان دەگێڕا و بانگەوازیان بۆ مەزهەبەکەی خۆیان دەکرد، ڕۆڵی سیاسی و سەربازیشیان وەك نەیاری دەسەڵاتی ئیسلامی هەبوو وەك ئیسماعیلیەکان کە چەند جارێك لەگەڵ دەوڵەتی مەملووکیدا کەوتنە جەنگەوە.[٥٢]

[٤٩]- الصلابی: صلاح الدين الأيوبی، ط١، دارالمعرفة، (بيروت/٢٠٠٨م)، ص٦٥٣-٦٥٤.

[٥٠] - الذهبی: تأريخ الأسلام، ج٤٨، ل٤٥؛ ابن كثير: س.پ، ج١٣، ل٢٢٣.

[٥١] - أبوزهرة: س.پ، ل١١٨.

[٥٢]- النويری: نهايةالأرب فی فنون الأدب، ط١، دارالكتب العلمية، (بيروت/٢٠٠٤م)، مج١٤، ج٣٠ص١٥٧.

هاوكات مەزهەبی موعتەزیلیش بەربڵاوبوو، هەر ئەمەش وا لە ئیبن تەیمیە دەكات كتێبی (درء تعارض العقل والنقل) بنووسێت كە ئیستا ۱/۳ی ماوەو ئەویتری فەوتاوە.[٥٣]

جگە لەمە كاریگەری مەنتیق و كەلام و فەلسەفە لەو سەردەمەدا ناڕوونیەكی لای موسڵمانان دروستكردبوو، ئیتر ئایینی ئیسلام تێكەڵ بەوانە كرابوو، ئەوانە بۆ بەرگریكردن لە ئیسلام هینرانە كایە، بەڵام دواتر لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە بەرپەرچ درانەوە،[٥٤] چونكە پێیان وابوو لەجیاتی خزمەتكردن زیان دەبەخشن، لەو زانایانەش كە ڕۆڵی كارایان لەو بوارەدا هەبووو تا ئەمرۆش ئەو ڕۆڵەی ماوە، ئیبن تەیمیەیە كە بەم هۆیەوە كتێبی وەك (الرد علی المنطقیین) دەنووسێت.[٥٥]

هەركام لەمانە جۆرە هاوارو بانگەشەیەكیان بوو، هەركامیان بە جۆرێك باسیان لە خودا دەكرد، موسڵمانەكانیش لەناو خۆیاندا هەركامەو بە شێوەیەك باسیان لە ئیسلام دەكرد، ئینجا ئیبن تەیمیە هاتو پەیامێكی نوێگەری ئایینی گرتەبەر و بانگەوازی دەكرد بۆ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەكانی ئیسلام كە بریتین لە قورئان و سوننەت و بۆ تێگەیشتن لەوانەش گەڕانەوەیە بۆلای هەڵگرانی یەكەمی ئیسلام.[٥٦]

---

[٥٣]- سالم: س.پ، ل٢٣.

[٥٤]- الندوي: س.پ، ل ٤٢٦-٤٢٧؛ خالد عبدالرحمن العك: الأصول الفكرية للمناهج السلفية عند شيخ الأسلام ابن تيمية، ط١، المكتب الأسلامی، (بیروت-دمشق-عمان/١٩٩٥م)، ص٧٩-٨١.

٥٥- محمد رشاد سالم: مقارنة بین الغزالي و ابن تیمیة، دار القلم، (كویت:١٩٩٢م)، ل ٢٣.

[٥٦]-أحمدالقطان و محمد الزین: شیخ الأسلام أحمد تقی الدین ابن تیمیة،ط٢، دارالأیمان، (اسكندریة)، ص١١٠.





# باسی سێیەم
## ( باری ژیاری و زانستی )

سەدەی حەوتەم و هەشتەمی كۆچی سەبارەت بە ژیاری ئیسلامی سەردەمێكی پڕ جموجووڵە، چونكە پێشینەیەكی ئەزموونی ژیاریی خیلافەتی بەغدادیان بۆ مابوویەوە كە هەر لە ئەحمەدی كوڕی تۆلۆنەوە گوازرابوویەوە بۆ میسر تا ئەوەی ئەحمەد هەوڵیدا خیلافەت بگوازێتەوە بۆ میسر،[٥٧] ئەو گورزە توندەش كە شاڵاوی بەربەری مەغۆلی لە ژیاری ئیسلامی وەشاند[٥٨] ئموسڵمانانی ناچاركرد تا جموجووڵیان زیادبكەنەوە بۆ سەرپێخستنەوەی ژیاری ئیسلامی.[٥٩]

ئەییوبیوكان هاوكات بە وەڵامدانەوەیان بۆشاڵاوە خاچیەكان، لەسەدەی حەوتەمدا ڕۆڵی بنیادیو ژیاریشیان بە ڕوونی دەبینی، ئەو خوێندنگانەش كە بنیادیان ناون یان نووسینەكانی ئەو سەردەمە بەڵگەی ئەمەن.[٦٠]

---

[٥٧]- محمد خضری بك: س.پ، ل١٦٤.

[٥٨]- الصیاد: س.پ، ل٣٢٧.

[٥٩] - عمار محمد النهار: العصرالمفتری علیه عصرالممالیك البحریة، ط١، دارالنهضة، (دمشق:٢٠٠٧م)، ص ٩٥.

[٦٠]- النویری: س.پ، ج٣٠ل٥٧؛ عمار محمد النهار: س.پ، ل١١٨-٢١٦.

بیناسازیش لەو سەردەمەدا زیاتر خۆی دەبینیەوە لە مزگەوت و خوێندنگەو نەخۆشخانەو شارو بیناو بونیاد و کۆشك و قەلا سەربزیەکان و کتێبخانەی ئیسلامی و دامەزراوەکانی دەوڵەت.[61]

لە سەردەمی مەملوکیشدا ئەمە هەر لە گەشەسەندندا بوو، هەرچەندە هەندێ لە مێژوونوسان بەو دیدە بۆیان دەڕوانن کە بە پێی سیفەتە جەنگیەکەیان تەنها مێژوویەکی خوێناویان بەرهەم هێناوە، بەڵام دەبێت بزانین ئەوان لەگەڵ پەروەردە جەنگیەکەیاندا پێشتر پەروەردەی ئاینی و زانستی دەکران،[62] بۆیە لەسەردەمی مەملووکیدا دامەزراندنی مزگەوت و خوێندنگەو نەخۆشخانەی زۆر بەدیدەکەین.[63]

خوێندنگە جیاوازە مەزهەبیەکانی شافیعی و مالیکی و...هتد لەوسەردەمەدا دادەمەزران،[64] زاناگەلێکی مەزهەبە جیاوازەکانیش دەرکەوتن، کەسانێکیش کە تا ئەمرۆش کاریگەرییان لەناو موسڵماناندا ماوە لەو سەردەمەدا ژیاون وەك ئیبن سەلاح[65] و

---

[61] – عادل زیتون: س.پ، ل٢١١.
[62] – ساویرس ابن المقفع: تأريخ البطاركة، ط١، مكتبة مدبولی، (القاهرة/٢٠٠٦م)، ج٣، ص٧٠٦-٧٠٧.
[63] – النويری: س.پ ، مج١٥، ج٣٠ل ٥٧؛ عادل زیتون: س.پ ، ل ٢١١-٢١٨؛ النهار: س.پ ، ل١١٩-١٣٣، ١٩٦-١٩٨.
[64] – العبادی: س.پ ، ل٩٦-٩٩، ١٦٧.
[65] زانای کوردی شارەزووری عوسمانی کوڕی عەبدوڕەحمان ناسراوەبە ئیبن صەلاح کە لەساڵی(٥٧٧ك)لەدایکبووەو لای زانایانی کوردی ناوچەکەی =





ـەولاتای ڕۆمی[66] و عەبدولحەلیمی کوڕی کوڕی عەبدوسەلام[67] و پێشەوا نەوەوی[68] و...هتد، یەکێکیش لە دیارترینەکانیان ئیبن تەیمیە بوو. بنیادنان و بواری ژیاری لە سەردەمی مەملوکیشدا بەردەوام بوو، بەڵکو سەرکردە مەملوکیەکان ململانێیان لەسەر ئەوە دەکرد، سوڵتان بیبرس یەکەم سەرکردەی موسڵمانان بوو کە

---

= خۆی زانستی وەرگرتووەو ڕۆڵ و کاریگەریەکی دیاری هەبووە لە مێژووی ئیسلامیدا، کۆمەڵێك نووسینیشی بەجێماون، لەساڵی( ٦٥٠ك/١٢٥٣ز) کۆچی دوایی کردووە. (بڕوانە: ابن خلكان: وفيات الأعيان، دارصادر، بيروت، ج٣، ص٢٤٣-٢٤٦).
[66] یەکێکە لە چاکسازانی ناو مێژووی ئیسلامی کە لە ساڵی ٦٠٤کۆچی لە بەلخ لە ئەفغانستان لەدایکبووەو گۆڕانێکی گەورەی لە کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەدا کردووەو تا ئەمڕۆیش ڕۆڵێکی دیاری ماوە، لەساڵی ٦٧٢ك.دا کۆچی دوایی کردووە. (بڕوانە: الندوی: م.ن.، ج١، ل٣٧٢-٣٧٩).
[67] ئەم زانایە باوکی ئیبن تەیمیەیەو لەساڵی(٦٢٧کۆچی ) لەدایکبووەو لەحەڕانەوە چووە بۆ شام و لەساڵی( ٦٨٢کۆچی ) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (ابن رجب: الذيل على طبقات الحنابلة، ط١، دارالكتب العلمية، (بيروت/١٩٩٧م)، ج٢، ص٢٥٣،٢٥٤).
[68] یەکێکە لە زاناکانی مەزهەبی شافیعی کەلەساڵی٦٣١ك. لەدایکبووەو زانستی وەرگرتووەو خزمەتێکی زۆری بە جیهانی ئیسلامی کردووەو چەندین نووسینی هەیە، لەساڵی ٦٧٦ك.دا کۆچی دوایی کردووە. (بڕوانە: ابن العماد الحنبلي: س.پ، ج٦، ل٨).

گۆڕینی بەرگی سالآنەی کەعبەی داهێنا، دروستکردنی مزگەوت و نەخۆشخانە و خوێندنگە و حەمامەکان و بازاڕو شەقام و چاککردنی ڕێگەوبان و گرنگیدان بە قەڵاکان لەسەردەمی مەملوکیدا بەدیدەکەین کە شوێنەواری هەندێکیان تا ئەمڕۆش ماوەتەوە.[٦٩]

سەبارەت بە لایەنی زانستی لەو سەردەمەدا، دەبێت ئەوە بزانین کە جیهانی ئیسلامی لە بواری زانستیدا ئەزموونێکی پێشینەی هەبوو، تەنانەت کەوتە ململانێی زانستی لەگەڵ جیهاندا و نووسینەکانی دەرەوەی دەهێنایە ناوخۆ و لەناو ژیاری خۆیدا موتربە دەکران، لەم دەرەنجامەوە زانستەکانی فەلسەفە و کەلام و مەنتیق دەرکەوتن و کاریگەری خۆیان نواند.[٧٠]

موعتەزیلەکانیش بیری عەقڵگەراییان بڵاوکردبوویەوە، گرفتەکانی جیهانی ئیسلامیش زانایانی لەم جەنگە زانستیە سەرقاڵکردبوو، بۆیە موعتەزیلەکان توانییان ڕۆڵی کارای خۆیان ببینن، بۆیە ئیبن صەلاح دەبینین بەرامبەر بە فەلسەفە دەوەستێت،[٧١] ئەوەوی گۆڕان دروست دەکات، عیززی کوڕی عەبدوسولامیش لەبەردەم شەریعەتدا چۆک بە دەسەلآتداران دادەدات، بەوەی لە جەنگی عەین جالووتدا مەرجیان لەسەر دادەنێت لە دانانی سامانیاندا بۆ جەنگەکە خۆیان پێش جەماوەر بکەون.[٧٢]

---

٦٩- العبادي: س.پ، ل١٦٦.
٧٠- خالد عبدالرحمن العك: س.پ، ل٧٩-٨١.
٧١- سالم: س.پ، ل٢٩.
٧٢- الذهبي: تأريخ الأسلام، ج٤٨، ص٤٥؛ ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٣، ل٢٢٣،







چەقبەستوییەکی مەزهەبی لەو سەردەمەدا ڕوویکردبووە جیهانی ئیسلامی کە ڕاستی زانستی لە موسڵمانان شێواندبوو، دەبینین زانا مەزهەبییەکان دژ بەوانیتر هەڵوێست دەنوێنن و فەتوا دەردەکەن،[٧٣] ڕادەربڕین لە دەرەوەی بازنەی مەزهەبی خۆیاندا قبوڵ ناکەن.[٧٤]

جیهانی مەسیحیش ئیتر لە سەدەی هەشتەمدا جەنگی سەربازی کەنارخست و جەنگی هزری و زانستی دەستپێکرد،[٧٥] مەغۆلەکانیش گورزێکی توندیان لە کتێبخانەی ئیسلامی وەشاند،[٧٦] هاوکات کتێبخانە لە دەوڵەتی مەملوکیدا لە شارەکاندا هەبوو، کتێبەکانیش یان لە ڕێگەی دیاریەوە بوون یان لە ڕێگەی کڕینەوە یان لەسەر گرتنەوەیان بوون، بوارە جۆربەجۆرەکانی وەک تەفسیر و فەرموودە و زمانەوانی و پزیشکی و جوگرافی و گەردوونی و...هتد یشی لەخۆدەگرت.[٧٧]

---

٧٣- الشوكاني: البدر الطالع بمحاسن من بعدالقرن السابع، ط١، دارابن كثير، (دمشق-بيروت/٢٠٠٦م)، ج١، ص٩٦.
٧٤- محمدأبوزهرة: س.پ ، ل١٢٦.
٧٥- علي بن نجيب الزهراني: الأنحرافات العقدية والعلمية، ط٢، دار طيبة، (مكة المكرمة:١٩٩٨م)، ج٢، ص٢٤٧.
٧٦- الصياد: س.پ، ل٣٢٧.
٧٧- النهار: س.پ، ل ٢٢٤؛ زيتون: س.پ، ل ١٨١،١٨٠.

# باسی چوارەم

## ( ڕەوشی ئابووریو کۆمەڵایەتی )

سەبارەت بە باروودۆخی ئابووری لەسەدەی حەوتەمو هەشتەمی کۆچیدا، خۆی لە بەرزو نزمی ئاستی ئابوری جیهانی ئیسلامیدا دەبینیەوە، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی ئاستی ئابوری جیهانی ئیسلامی بەرزبوو تائاستێك میرنشینە خاچیەکانی شام بۆ نرخدان بە دراوەکانیان شێوە نووسینی ئیسلامییان هەڵدەبژاردو ئایەتیان لەسەر دەنووسی،[٧٨] بەلاّم لە کاتە سەختەکانی جەنگدا ئاستی ئابوری ئیسلامی بەرەو تەنگژە دەچوو وەك برسێتیەکەی ساڵی(٦٦٢ك/١٢٦٤ز).[٧٩]

سەبارەت بە دراوی دەوڵەت ئەوا دراوەکەیان لە زێڕ و زیو و مس دروست دەکرا،[٨٠] تیایدا جگە لە نووسینی ئایەتی قورئانی ناوی خەلیفە و ناوی سوڵتانی دەسەلاّتدار دەنوسرا، بەلاّم لە سەردەمی مەملوکیدا سوڵتان بیبەرس لە خەلیفەی دووەمی عەبباسیەوە ناوی خەلیفەکانی لەسەر دراو دانەدەنا.[٨١]

---

[٧٨]- العبادی: س.پ، ل١٠٣.

[٧٩]- قاسم: س.پ، ل ١٦٣.

[٨٠]- ه.س: ل٨٠.

[٨١]- العبادی: س.پ ، ل١٦١.





سەرچاوەکانی دارایی دەوڵەت خۆیان دەبینیەوە لە خەراج و زەکات و سەرانە و گومرگی سەرسنور و لێدانی دراو و بەکارهێنانی سامانی سوڵتان و دەوڵەت لە بازرگانیدا و ئەو کانزایانەی لە زەوی دەردەهێنران، جگە لەو باج و سەپاندنانەی دیکە کە لەشەریعەتی ئیسلامدا نەچەسپابوون و نەهاتبوون.[٨٢]

لەکاتی جەنگدا هەوڵ دەدرا پارە و سامان لە خەڵکی کۆبکرێتەوە، بەلاّم فشاری زانایانی ئیسلام لەسەر دەسەلاّتداران زۆر بوو وەك چۆن عیززەدینی کوڕی عەبدولسەلام لە جەنگی "عەین جالوت"دا فشاری لەسەر سوڵتان قوتز دانا،[٨٣] بەڵکو دادوەری لەدەست زانایاندا بوو[٨٤]،

سەبارەت بە پیشە ئابوریەکانی ئەو سەردەمە خۆی دەبینیەوە لە کشتوکاڵ کە گرنگیەکی زۆری هەبوو و پاڵپشتێکی بەهێزی داهاتی ولاّت بوو، خەڵکێکی زۆر بەم پیشەیەوە سەرقاڵبوون،هەروەها پیشەسازی کە خۆی دەبینیەوە لە پیشەسازی سەربازی و پیشەسازی مەدەنی، هەریەك لەو دوو پیشەسازیانە گرنگیەکی زۆریان پێدەدرا، هەرچی پیشەسازی

---

٨٢- زیتون: س.پ ، ل١٩٧-٢٠٠.

٨٣ - الذهبی: تأریخ الأسلام، ج٤٨، ل٤٥؛ ابن کثیر: س.پ، مج٧، ج١٣ل٢٢٣.

٨٤ - محمد خضري بك: س.پ، ل ١٩٢.

جەنگی بوو بریتی بوو لە کەشتی سازی و چەکسازی و جل و بەرگ و ......هتد، بواری پیشەسازی مەدەنیش خۆی لە زۆر بواردا دەبینیەوە.[٨٥]

ئینجا پیشەی بازرگانی دێت کە ڕێگەی بازرگانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ئەوروپای لەخۆ دەگرت و ڕۆڵێکی دیاری هەبوو سەرکردەکانیش گرنگیەکی زۆریان پێدەدا، بەڵکو پاسەوانیان دادەنا بۆ پاراستنی ڕێگەکان و ڕێزی زۆری بازرگانانیان دەگرت بۆ ئەوەی ناوبانگی بازرگانیان هەبێت.[٨٦]

لەبەرئەوەی دەوڵەتی مەملووکی دەستیگرتبوو بەسەر ڕێگە بازرگانیەکانی دەریای سوورو ناوچەکەدا، بۆیە وڵات دارایی بەهێزبووو بازاڕی پڕجموجووڵ بوو.[٨٧]

سەبارەت بە لایەنی کۆمەڵایەتی، ئەوا هەریەکە و دابەشکاریەك بۆ چینە کۆمەڵایەتیەکان مقریزی دابەشیاندەکات بۆ حەوت چینی کۆمەڵایەتی،[٨٨]بەگشتی دەتوانین دابەشکاری چینایەتی کۆمەڵایەتی ئەوکات بەمجۆرە بخەینە ڕوو، دەسەڵاتداران، زانایان، خەڵکی گشتی:[٨٩]

---

٨٥- زیتون: س.پ، ل١٨٢-١٨٨.

٨٦- ه.س: ل١٨٩-١٩٦.

٨٧- ادوارد برو‌ی: س.پ ، ج٣، ل٥٥١.

٨٨- بە وەرگرتن لە: قاسم: س.پ، ل١٢ پەراوێزی ١٣.

٨٩- أبوزهرة: س.پ، ل ١٢٤.







یەکەم: چینی دەسەڵاتداران، ئەمە خۆی دەبینیەوە لە سەرکردە سیاسی و سەربازی و کارگێڕیەکانی دەوڵەت کە سوڵتان بەرزترین پلەو پایە و قەڵەمڕەوی هەبوو، ئەم کەسانە لەچەند خاڵێکدا پەیوەندیان هەبوو بە زانایان و کۆمەڵگەوە،[٩٠]بۆ ڕیزبەندی دەسەڵاتەکانیش یەکەم کەس خەلیفە دهات، پاشان سوڵتان، ئینجا والیەکان.[٩١]

دووەم: زانایانی ئیسلام، ئەمانە لای دەسەڵاتداران و لای کۆمەڵگەش پلە و پایەیەکی بەرزیان هەبوو، بەڵکو زۆرجار ئەڵقەی پەیوەندی نێوانیان بوون،[٩٢] یان لەسەردەمی دواتردا ئیبن تەیمیە دەچێتە میسر و سوڵتانی هاندا تا دژ بە مەغۆلەکان بجەنگن، بەلاّم دوایی کە هاتەوە بەسەرکردەکانی وت:"من موڵکی کۆمەڵگەم نەوەك ئێوە".[٩٣]

سێیەم: چینی گشتی کۆمەڵگە، ئەمەش دەتوانین لەچەند ڕوانگەیەکەوە دابەشکاری بۆ بکەین، سەبارەت بە دابەشکاری ئاینی ئەوا موسڵمان و مەسیحی و جولەکەکانی لەخۆ دەگرت کە

---

٩٠- القطان: س.پ، ل٢٤.

٩١- القلقشندي: صبح الأعشى في صناعة الإنشا، ط١، دار الفكر، (دمشق/١٩٨٧م)، ج٩، ل٢٥١.

٩٢- العبادي: س.پ ، ل١٣٨، ١٥٦.

٩٣- الحسامي: س.پ ، ل٢٠٣-٢٠٦.

لەروی ژمارەوە موسڵمانەکان بە پلەی یەکەم و مەسیحیەکان بە پلەی دووەم و جولەکەکانیش بەپلەی سێیەم دەهاتن، پەیوەندی کۆمەلاٌیەتی لەنێوانیاندا هەبوو تەنانەت لە چەندێك لە جەژنەکاندا بەشداری یەکتریان دەکرد وەك ساڵیادی لەدایکبوونی پێغەمبەر عیسا"سەلامی خوای لێبێت".[٩٤]

چینی گشتی موسڵمانەکان لەنێو خۆیاندا خۆشەویستیەکی زۆریان هەبوو، بەلاٌم ئەمە هەمویانی نەدەگرتەوە، جەژنەکانیشیان بریتی بوون لە جەژنی رەمەزان و قوربان و چەند بۆنەیەکیشیان هەبوو، جەژنی مەسیحیەکایش بریتی بوون لە حەوت جەژنی گەورە و حەوت جەژنی بچوك بۆ نمونە جەژنەکانی "زەیتونە و بەشارە و خەمیس و.....هتد".[٩٥]

جەژنی جولەکەکان بریتیبوو لە جەژنی سەری ساڵ کە عیبری کۆن ناسرابوو بە "راش عیشا" و جەژنی کبور و جەژنی "الظلل" و جەژنی "الفطیر" و جەژنی "الأسابیع" و چەند جەژن و بۆنەیەکی داهێنراوی تری نوێ و وەك جەژنی بوریم و جەژنی جەنگە.[٩٦]

لە میسردا پێکهاتە جیاوازەکانی وەك تورك و میسری و شامی و عێراقی و فەرەنج و تەتار و ئەرمەن و ئیسرائیلیەکان دەژیان.[٩٧]

٩٤- قاسم: س.پ، ل١٢٤.
٩٥- هـ.س: ل١٢٢-١٢٤.
٩٦- هـ.س: ل١٢١-١٢٢.
٩٧- محمد یوسف موسى: ابن تیمیة، ط٢، العصر الحدیث، (بیروت:١٩٨٨م)، ل٢٩.







# بەشی دووەم

# ڕەچەڵەك و ژیان و بەرهەمەکانی ئیبن تەیمیە

# باسی یەكەم

# ( لەدایكبوونی و بنەماڵەكەیو گەورەبوونی )

ئـیبن تەیمیـە نـاوی ئەحمـەدی كـوڕی عەبدولحـەلیمی كـوڕی عەبدوسەلامی كوڕی عەبدولاّی كوڕی ئەبولقاسمی كوڕی خچری كوڕی موحەممەدی كوڕی تەیمیەی حەڕانیە،٩٨ لە سەرچاوەكاندا زیاتر بەمجۆرە ناوی هاتووە: الشیخ الامام الفقیە المفسر الحافڤ المحدپ الامام الربانی نادره العصر الاصولی الزاهد المجتهد علم الاعلام الائمە ومفتی الٌمە بحر العلوم قریح الدهر علامە الزمان ترجمان القران قامع المبتدعین برکە الٌنام فارس المعانی والٌلفاڤ سید الحفاظ مفتی الفرق شیخ الاسلام تقی الدین احمد.٩٩

[98] – النـويري: س.پ، مـج١٥، ج٣٣، ل٢٠٩–٢١٠؛ الجـزرى: تـأريخ حـوادث الزمـان و أنبائـه و وفيـات الأكـابر والأعيـان مـن أبنائـه، المكتبـة العـصرية، (بيروت/٢٠٠٦م)، ج٢، ص٣٠٦؛ ابـن عبـدالوهاب: العقـود الدريـة فى مناقـب شيخ الأسلام ابن تيمية، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت/ ٢٠٠٥م)، ص٥٧؛ صفي الـدين البخـاري: القول الجلي في ترجمة شيخ الأسلام تقي الـدين ابن تيمية الحنبلي، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت/٢٠٠٥م)، ص٣٢١؛ الحنبلـي: شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ط١، دار الكتب العلميـة، (بيروت/١٩٩٨م)، ج٦ص٢٤١؛ الشوكانى: البدر الطاع بمحاسن من بعد القرن السابع، ط١، دار ابن كثير، (بيروت/٢٠٠٦م)، ج١ص٩٤.

[99] – النويرى: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢٠٩؛ الجـزرى: س.پ، ج٢، ل٣٠٦؛ ابن عبـدالوهاب: س.پ، ل٥٧؛ الكـتبي: فـوات الوفيـات، ط١، دارالكتـب العلميـة، (بـيروت/٢٠٠٠م)، ج١ص٢٤؛ ابـن كـثير: س.پ، مـج٧، ج١٤، ل١٣٧–١٣٨؛ = =ابـن رجـب: س.پ، ج٢، ل٣٢١؛ صـفي الـدين البخـاري: س.پ، ل٣٠٦؛ الكرمـي: الكواكب الدرية في مناقب شيخ الأسلام ابن تيمية، ط١، دارالكتب =





لـە ڕۆژی دوو شـەممە ١٠ ی ڕەبیعولئـەوەلی سـاڵی (٦٦١ك/١٢٦٣ز)ی كۆچی لە شاری حەڕان لەدایك بووە.١٠٠

سەبارەت بە شاری حەڕان: دەكەوێتە خاكی جەزیرە لە نێوان دیجلەو فوراتدا كە شوێنی كۆچی پێغەمبەر ئیبراهیم بووە، هارانی برای ئیبراهیم دروستیكردووەو بە ناوی ئەوەوە ناونراوە، دواتر ناوەكـە ی كـراوە بـە حـەڕان، لـەم شـارەدا صـابیئەكان ژیـاون، لـە ڕۆژانی خەلیفە عومەری كوڕی خەتتابدا(١٣ك–٢٣ك/٦٣٤ز–٦٤٤ز) فەتحكراوەو لەسەردەستی عیاچی كوڕی غەنەم شاری حەڕان كەوتووەتە ناو دەسەڵاتی ئیسلامەوەو دەسەڵاتی ئومەوی وعەبباسی و سەلجووقیو ئەییوبییەكان بەسەر ئەم شارەدا هەبووە تا شاڵاوی مەغۆلی كە شارەكەیان وێرانكردو كشتوبڕیان تێدا ئەنجامدا.١٠١

= العلمية، (بيروت/٢٠٠٥م)، ص٣٢٠؛ اليافعي: مـراة الجنـان وعـبرة اليقظـان، دار الكتـاب الأسـلامي، (القـاهرة/١٩٩٣م)، ج٤ص٢٧٧؛ الـصفدى: س.پ، ج٧ص١١؛ ابن العماد: س.پ، ج٦، ل١٣٣؛ الشوكاني: س.پ، ج١، ل٩٤؛ ابن مفلـح: المقـصد الأرشـد في ذكـر أصـحاب الأمـام أحمـد، ط١، مكتبـة الرشـد، (الرياض/١٩٩٠م)، ج١،ص١٣٣.

[100] – الـذهبى: تـأريخ الأسـلام ج٤٩ص٩٢؛ ابـن عبـدالوهاب: س.پ، ل٥٨، الصفدى: س.پ، ج٧، ل١١؛ ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣٨؛ ابن رجب: س.پ، ج٢، ل٣٢١.

[101] – صائب عبدالحميد: ابن تيمية، مطبعة الغدير، بيروت، ص٢٢–٢٥.

باوکی ناوی عەبدولحەلیم بووەو لە سەرچاوەکاندا بە:"شهاب الـدین أبوالمحاسن عبدالحلیم" ناوی هاتووە،[١٠٢] لە ساڵی (٦٢٧ك/١٢٣٠ز) لە حەڕان لەدایکبووە[١٠٣]و فەرموودەی لە باوکی بیستووە و زانستی لێوەرگرتووە، دواتر سەرقاڵی وانە وتنەوەو فەتوادان و نووسین بووە، ڕۆڵێکی دیاریشی لەناو کۆمەڵگە و دەوڵەتدا هەبووە،[١٠٤] لەبەر ئەوەی کەوتبویە نێوان باوکی و کوڕەکەی خۆی، بۆیە بە نێوەندی نێوان مانگ و خۆر دادەنرێت،[١٠٥] سەر بە مەزهەبی حەنبەلی بووە،[١٠٦] لە ساڵی (٦٨٢ك/١٢٨٣ز)دا مرد و لە دیمەشق لە گۆڕستانی (الصوفیە) بە خاك سپێردراوە.[١٠٧]

١٠٢ - ابن عبدالوهاب: س.پ، ل ٥٧؛ ابن رجب: س.پ، ج٢، ل٢٥٣" ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة وزارة الثقافة والأرشاد القومي، مصر، ج٦ص٣٤.

١٠٣ - ابن تغري بردى: س.پ، ج٧، ل٣٥٩.

١٠٤ - ابن رجب: س.پ، ج٢، ل٢٥٣؛ ابن العماد: س.پ، ج٦، ل٣٤-٣٥؛ ابن مفلح: س.پ، ج٢، ل١٦٦.

١٠٥ - ابن رجب: س.پ، ج٢، ل٢٥٣.

١٠٦ - ابن العماد: س.پ، ج٦، ل٣٤؛ اليافعي: س.پ، ج٤، ل١٩٧.

١٠٧ - ابن تغري بردى: س.پ، ج٧، ل٣٦٠.







باپیریشی ناوی عەبدوسەلام بووە و لە سەرچاوەکاندا بە:"شیخ الأسلام الأمام المجتهد المحدث المفسر الأصولی مجدالدین أبوالبرکات عبدالسلام" ناوی هاتووە،[١٠٨] لە ساڵی(٥٩٠ك/١١٩٤ز) لە حەڕان لەدایکبووە و لەوێ هەموو قورئانی لەبەرکردووە و زانستی وەرگرتووەو دواتر لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز) چووە بۆ بەغداد و لەوێش زانستی وەرگرتووەو لەنێوان حەڕان و بەغدادا هاتووە و ڕۆشتووە، پرسیاری لێکراوە و چوەتە شام و عێراق و حیجاز و وانەی وتوەتەوە و نووسینی هەبووە،[١٠٩] لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لەدوای نوێژی هەینی لە جەژنی ڕەمەزانی ساڵی(٦٥٢ك/١٢٥٤ز) لە حەڕان مرد، لەوێش بەخاکسپێردرا.[١١٠]

دایکی ناوی (ست النعم)ی کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوسی حەڕانیە،[١١١] زیاتر لە ٧٠ ساڵ تەمەنی هەبووەو کچی نەبووە، لە ڕۆژی چوار شەممە شەوالی ساڵی ( ٧١٦ك/١٣١٧ز) دا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (الصوفیە) بەخاك سپێردرا.[١١٢]

١٠٨ - ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٥٧؛ ابن رجب: س.پ، ج٢، ل٢٠١؛ ابن العماد: س.پ، ج٥، ل٣٨٧.

١٠٩ - ابن العماد: س.پ، ج٥، ل٣٨٧.

١١٠ - ابن كثير: س.پ، ج١٣، ل١٩٣.

١١١ - ابن الوردي: تأريخ ابن الوردي، ط١، دار الكتب العلمية، (بیروت/١٩٩٦م)، ج٢ص٢٥٦.

١١٢ - الحسامي: س.پ، ل٥.

ئیبن تەیمیە سێ برای هەبوو:

موحەممەدی كوڕی خالیدی كوڕی ئیبراهیمی حەڕانی كە لەدایكیەوە برای بووە، لەساڵی(٦٥٠ك/١٢٥٢ز) لە حەڕان لەدایكبووەو بە زانایەكی دیاری سەردەمی خۆی ئەژمارد دەكرێت، لە ڕۆژی چوارشەممە هەشتی جەمادیلئاخیری ساڵی (٧١٧ك/١٣١٨ز) كۆچی دواییكردو لای دایكی لە گۆڕستانی (الصوفیە) بە خاك سپێردرا.[113]

عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدولحەلیم كە بەزەینەدین ناسراوەو لە ساڵی(٦٦٣ك/١٢٦٥ز) لە حەڕان لەدایكبووە،[114] ئەمیش دواتر بەندكرا و لە ٢٦ی ژیلقەعدەی ساڵی( ٧٢٨ك/١٣٤٧ز) ئازادكرا،[115] لە دوای مردنی ئەحمەدی برای ژیاوەو لە ساڵی(٧٤٧ك/ ١٣٤٦ز) مردووە، سەرقاڵی بازرگانی بووە.[116]

عەبدوڵای كوڕی عەبدولحەلیم لە ڕۆژی عاشورای ساڵی (٦٦٦ك/١٢٦٧ز) لە شاری حەڕان لەدایكبووە، بە شەرەفەددین ناودەبرێت،[117] بەمجۆرە وەسفكراوە" الشیخ الأمام العالم العامل

[113] – ابن العماد: س.پ، ج٦، ل١٩٤.
[114] – هـ.س: ج٦، ل٣٣٢.
[115] – ابن الجزری: س.پ، ج٢، ل٢٧٣.
[116] – ابن العماد: س.پ، ج٦، ل٣٣٢.
[117] الذهبی: تاریخ الأسلام، ج٤٩، ل٢٣٢.







العلامة الزاهد العابد الورع الخاشع الناسك الصالح االعارف بقیة السلف تراض الخلف القدوة المفتن شرف الدین أبو محمد"،[118] زانایەكی گەورە بووەو لەگەڵ ئەحمەدی برای پێنج ساڵ تەمەنیان نێوانە،[119] لە ڕۆژی چوارشەممە ١٤ی جەمادیلئولای ساڵی( ٧٢٨ ك/١٣٤٧ز) دا كۆچی دوایی كردو ئەحمەدو عەبدوڕەحمانی برای و خەڵكێكی زۆر نوێژیان لەسەركردو مراسیمێكی كەموێنەی بۆ گێڕدراو لای دایك وباوكی لە گۆڕستانی (الصوفیە) نێژرا.[120]

بنەماڵەی ئیبن تەیمیە زۆربەیان زانستخوازو زانا بون و بە پێشەوا ناوبراون و سەر بە مەزهەبی حەنبەلی ئەژمارد كراون[121] و بە درێژایی مێژوو لە حەران بون تا ئەوەی شاڵاوی مەغۆلی لە حەڕان بەرەو حەلەب و دیمەشق دووریاندەخاتەوە.[122]

سەبارەت بە ناونانی ئەم بنەماڵەیە بە تەیمیە، ئەم ناوە لە موحەممەدی كوڕی خچرەوە دەستپێدەكات،[123] لەسەر ئەو ناونانەش چەند ڕایەك هەیە:

[118] – الجزری: س.پ، ج٢ص٢١٤؛ الذهبي: معجم المحدثین، ط١، دار الكتب العلمیة، (بیروت/١٩٩٣م)، ج١ص١٢١-١٢٢؛ ابن مفلح: س.پ، ج٢، ل٤٢.
[119] – ابن الجزری: س.پ، ج٢، ل٢١٦.
[120] – ابن مفلح: س.پ، ج٢، ل٤٢؛ ابن الجزری: س.پ، ج٢، ل٢١٤.
٣- القنوجي:الحطة فى ذكر الصحاح الستة، ط١، دار الكتب التعلیمیة، (بیروت/١٩٨٥م)، ص١٥١
[122] – الصفدی: س.پ، ج٧ص١١؛ محمد یوسف: س.پ، ل٧١؛ الندوی: س.پ، ج٢، ل٤٤٨.
[123] – الندوی: س.پ، ج٢، ل٤٤٨.

ڕایەک دەڵێت محمدی باپیری کە لە ڕێگەی حەجدا بووە کچێکی لە ڕێگەی تیما ودا بینیوە، کە گەڕاوەتەوە دەبینێت ژنەکەی کچێکی بووە، ئەویش دەڵێت (یاتیمیە، یاتیمیە) لەمەوە ئەم ناوەیان لێنراوە.١٢٤ ڕایەکەی دەڵێت چونکە دایکی موحەممەدی باپیری بە تەیمیە ناسرابوو، بۆیە ئەو ناوەیان بەسەردا برا.١٢٥

ڕەچەڵەکی ئیبن تەیمیە و بنەماڵەکەی:

هیچ سەرچاوەیەک لە هەواداران و نەیارانی ئیبن تەیمیە باسی ڕەچەڵەکیان نەکردووەو هیچیان لەسەر نەهێناوە، بەڵام کەسایەتی و ناوبانگەکەی وایکردووە ڕای جیاوازی لەسەر دروستبێت و هەرکامو بیدەنەوە پاڵ خۆیان،١٢٦هەندێک پێیان وایە عەرەبە چونکە نووسین و قسەکردن و شارەزایی لە عەرەبیدا بووە،١٢٧ بەڵام ڕای زیاتر لەسەر ئەوەیە کە ئیبن تەیمیە کوردە، چونکە شاری حەڕان شارێکی کوردیە و ئەو بنەماڵەش هەر لەوێ ژیاون و دواتر کۆچیانکردووە بۆ دیمەشق بۆ ناو عەرەبەکان.١٢٨

١٢٤ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٥٨؛ الكرمي: س.پ، ل٣٢١؛ الأربلي: تاريخ اربل، وزارة الثقافة والإعلام، (العراق/١٩٨٠م)، ص٩٧.

١٢٥ – الغصن، عبدالله بن صالح: دعاوى المناوئين لإبن تيمية، ط١، دار ابن الجوزي، (الرياض:١٤٢٤هـ).ص٢٢" الحسامي: س.پ، ل٤.

١٢٦ – أبوزهرة: س.پ، ل١٨.

١٢٧ – شلش، عدنان بن محمد بن عبدالله: شيخ الإسلام ابن تيمية محدثا، ط١، دارالنفائس، (عمان:٢٠٠٥م)، ص٣٩.

١٢٨ – أبو زهرة: س.پ، ل١٨.







ئەبولحەسەنی نەدەوی شاری حەڕان دەداتەوە پاڵ ناوچەی جەزیرە لە نێوان دیجلەو فورات و تێکەڵ بە شارە کوردیەکانی وەک دیاربەکر، ئەمەش ئاماژەیە بە کوردبوونی ئیبن تەیمیە.١٢٩ موحەممەد ئەبووزەهرەش پێی وایە ئیبن تەیمیە کوردە، بۆ ئەمەش چەند بەڵگەیەک دێنێتەوە:

چونکە ئیبن تەیمیە تەنها دراوەتەوە پاڵ شاری حەڕان و بنەماڵەکەی لەوێ بون، نەدراوەتەوە پاڵ هیچ هۆزێکی عەرەبی، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی کە عەرەب نەبووە.

چونکە کورد گەلێکی بە ورەو توندو لێهاتوون و بە هێزی لە ڕەوشتیاندا هەیەو ئەم سیفەتانەش بە ڕوونی لە کەسایەتی ئیبن تەیمیەدا بەدیدەکرێن.

کوردەکان لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی کۆچیدا ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە خزمەتکردنی جیهانی ئیسلامیدا و دژی شیعەی دەوڵەتی فاتیمی و دواتر هەڵمەتی خاچپەرستان وەستاونەتەوەو موسڵمانانیان ڕزگار کردون.١٣٠

١٢٩ – الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٤٧.

١٣٠ – أبوزهرة: س.پ، ل ١٨-١٩.

## چوونی بۆ دیمەشق:

کاتێك شاڵاوی مەغۆلی مەترسی لای زۆرێك لە موسڵمانان دروستکرد، بنەماڵەی ئیبن تەیمیە لەدەست توندوتیژی و دڕەندەیی ئەو شاڵاوە حەڕانیان بەجێهێشت و چوون بۆ دیمەشق،[131]تەمەنی ئیبن تەیمیە ئەوکات شەش ساڵ بوو.[132]

لە بەجێهێشتنی شارەکەشدا شەویان هەڵبژارد، لەبەرئەوەی ئاژەڵیان دەستنەکەوت، کتێبەکانیان لەسەر عەرەبانەیەك بارکرد تا نەفەوتێن، ئەمەش بەڵگەی گرنگی و بەهاداری زانست بووە لای ئەو خێزانە.[133]

لەو سەردەمەدا دیمەشق مەڵبەندێکی گەورەی زانست و زانایان بووەو کەسانی وەك نەوەوی و ئیبن دەقیق و موززی و زەمەلکانی وانەیان تێدا وتوەتەوە،[134] مەزهەبەکانیش خوێندگەی خۆیان هەبووە، هەندێکجار خوێندنگەیەك بۆ یەك زانست یان یەك مەزهەب تایبەت دەکرا.[135]

---

[131] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل ٥٨؛ الكرمي: س.پ، ل ٣٢١؛ ابن العماد: س.پ، ج٦، ل٢٤١؛ أبو زهرة: س.پ، ل ١٧–١٨.
[132] – الحسامي: س.پ، ل٧.
[133] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٥٨؛ الكرمي: س.پ، ل٣٢١.
[134] – ابوزهرة: س.پ، ل٢٣.
[135] – القطان: س.پ، ل٣٤؛ موسى: س.پ، ل٦٢





لە کاتی کۆچەکەیاندا بۆ دڵنیابوون لە ڕزگاربوونیان، پەنایان بۆ لای خوا بردووەو لێی پاڕاونەتەوە تا ڕزگاریان بێت، ئەمەش بەڵگەی بڕوابوونی زۆری ئەو بنەماڵەیە بە خوا.[136]

شێخ شەهابەدینی باوکی ئیبن تەیمیە لەگەڵ ئەوەی گەیشتە دیمەشق ناوبانگی دەرکردو کەوتە وانەوتنەوەو ئامۆژگاریکردنی خەڵك لە مزگەوتی گەورەی دیمەشق، دواتر بووبە سەردەستەی( دار الحديث السكريه) لەوێش دادەنیشت، هەر لەوێ ئەحمەدی کوڕیشی پەروەردە کردو وانە جۆراوجۆراکانی شەریعەتی فێرکرد.[137]

شەهابەدین لە پێشکەشکردنی وانەکانیدا پێنووس و پەڕەی بەکارنەدەهێنا، چونکە تەواو بەسەر بابەتەکاندا زاڵبوو،[138]بەمجۆرە تواناو حەزە زانستیەکانی شەهابەدین پاڵنەربوون تا ئیبن تەیمیە لەو بارە سەختەدا هەنگاو بەرەو زانست بنێت و لەماوەیەکی کەمدا ڕۆڵێکی گەورە ببینێت.[139]

ئیبن تەیمیە لەتەمەنی گەنجی و لە ساڵی( ٦٩٢ك/١٢٩٢ز) دا لەگەڵ کاروانێکی حاجیان چوو بۆ حەج، لە ڕێگەدا بەهۆی ڕەشەبایەکی توندەوە هەندێك لە ئەندامانی کاروانەکە مردن، بەڵام ئیبن تەیمیە و زۆرێکی تریان دەربازبوون.[140]

---

[136] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٥٨؛ الكرمي: س.پ، ل٣٢١؛ الحسامى: س.پ، ل٧.
[137] – ابن العماد: س.پ، ج٦، ل٣٤؛ الندوى: س.پ، ج٢، ل٤٥١.
[138] – ابوزهرة: س.پ، ل١٩.
[139] – هـ.س، ل١٩–٢٠.
[140] – الندوى: س.پ، ج٢، ل٤٥٧.

**جلوبەرگی ئیبن تەیمیە:**

جلوبەرگی کەشخەو دیارو تۆخی نەدەپۆشی تا لە خەڵك جیانەبێتەوە، بەڵکوو وەك کەسانی سادە جلی ئاسایی دەپۆشی،[١٤١] جۆری جلوبەرگیشی دەگۆڕی و هەرجارەو چی لەدەست بهاتایە ئەوەی دەپۆشی، لە هەڵبژاردنی پۆشاکیشدا ماڵەوەیان بۆیان دیاری دەکرد و بۆیان دەهێنا.[١٤٢]

[١٤١] – البزار: الأعلام العلية في مناقب ابن تيمية، ط١، دارالكتب العلمية، (بيروت/٢٠٠٥م)، ص٦٠٤.

[١٤٢] – الكرمي: س.پ، ل٣٤١.







# باسی دووەم

## ( ژیانی زانستخوازی )

ئیبن تەیمیە هەر بە منداڵی توانایەکی زۆری لەبەرکردنی هەبووە، تەنانەت لەو بوارەدا ناوبانگی دەرکردبوو،[١٤٣] زانایەکی حەلەبی هاتە دیمەشق و ناوبانگی ئیبن تەیمیەی بیستبوو، وتی: "بیستوومە لای ئێوە کوڕێك هەیە پێی دەڵێن ئەحمەد کە لە لەبەرکردندا خێرایە، جا هاتوم بەڵکوو ببینم"[١٤٤]ئینجا ڕێنموونی کرا تا چاوەڕوانی بکات، کە ئیبن تەیمیە هات لەوحێکی پێبوو، زانای حەلەبی لەوحەکەی سەیرکردو داوای لە ئیبن تەیمیە کرد تا چی تێدا نووسراوە بیسڕێتەوە تا شتێکی پێبڵێت و بینووسێت، ئەویش نووسینەکەی سڕییەوەو زاناکەش دەقی چەند فەرموودەیەکی پێوت کە یانزە یان سیانزە فەرموودە دەبوون، بە ئیبن تەیمیەی وت: "ئەوە بخوێنەرەوە"، ئەویش سەیرێکی نووسینەکەی کردو پاشان لەوحەکەی لابردو بەبێ هەڵە فەرموودەکانی بۆ وتەوە، پاشان زانای حەلەبی ئەوەشی بۆ سڕیەوە وچەند سەنەدێکی فەرموودەی پێنووسی، ئیبن تەیمیە وەك جاری پێشوو هەمووی بۆ وتەوە، زانای حەلەبی سەرسام

[١٤٣] – الندوی: س.پ، ج٢، ل٤٥٢.

[١٤٤] - ابن عبدالوهاب: س.پ، ل ٥٩.

بوو و وتی:"ئەگەر ئەم کوڕە بمێنێت ڕۆڵ و کاریگەریەکی گەورەی دەبێت، چونکە شتی وانەبینراوە".١٤٥

هێشتا ئیبن تەیمیە تەمەنی منداڵی تێنەپەڕاندبوو کە ڕۆژێك باوکی بڕیاریدا منداڵەکانی بباتەدەرەوە بۆ گەڕان، بە ئەحمەدی:"وت لەگەڵ براکانت وەرە با کەمێك بحەسێیتەوە"، بەڵام تەیمیە حەزینەکردو هەرچەندە باوکی پێی وت، ئەحمەد داوایکرد نەچێت و بمێنێتەوەو وتی"وام پێخۆشە ڕێم پێبدەیت نەیەم"، باوکیشی ڕازیبوو و منداڵەکانی تری برد، کاتێك ئێوارە گەڕانەوە باوکی جۆرە لۆمەیەکی کرد کە چ سودێکت بینی نەهاتی، ئەحمەد وتی"ئەمڕۆ ئەم کتێبەم لەبەرکردوە"، باوکی بڕوای نەبوو توانیبێتی شتی وا بکات، بۆیە کتێبەکەی لێوەرگرت و لێی پرسیەوە، ئەحمەد هەمووی بە لەبەرکردنەوە بۆ خوێندەوە، باوکیشی لەترسی ناحەزان وتی: کوڕی شیرینم بە کەس مەڵێ شتی واتکردووە".١٤٦

تەیمیە لەمنداڵیەوە لە خوێندنگەو بۆنەکاندا ئامادە دەبوو، لەگەڵ کەسایەتیە گەورەکاندا دادەنیشت و زانستێکی زۆری وەردەگرت و لێهاتوویی خۆی سەلماند١٤٧ تائەوەی لەتەمەنی

---

١٤٥ – هـ.س.

١٤٦ ابن ناصرالدین: س.پ، ل ٥١٠–٥١١.

١٤٧ ابن الوردی: س.پ، ج٢، ل٢٧٦؛ خالد عبدالرحمن العك: س.پ، ل ٢٩.







ڕێگەی حەڤدە ساڵیدا فەتوای دەرکرد، هەرلەو کاتەیشەوە دەستیکرد بە نوسین.١٤٨

زۆربەی کاتی خۆی لە وەرگرتنی زانستە جۆربەجۆرەکان و هاودەمی لای زانایان بەسەردەبرد، زیاتر گرنگیدانیشی بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) بوو،١٤٩ ئیبن تەیمیە خۆی دەڵێت کە سەد کتێبی تەفسیری خوێندوەتەوە، هاوکات خۆی فێری جوان نووسین کردووە.١٥٠

ژەهەبی باس لەتەمەنی سەرەتای ئیبن تەیمیە دەکات کە چۆن لە زانستدا پێگەشتووە و دەڵێت:"لێم بیستووە دەیوت: جار هەبوو لە شتێکدا ئەندێشەم دەوەستا یان لێم دەبوو بە گرفت، بۆیە هەزارجار یان زیاتر یان کەمتر ( استغفرالله ) م دەوت تا سنگم فراوان بێت و گرفتەکەم لا نەمێنێت... جار هەبوو ئەوکات لە بازاڕ یان مزگەوت یان ڕێگە یان خوێندنگەدا دەبووم، ئەوانیش لێم نەدەبوونە ڕێگر تا بگەمە خواستەکەم".١٥١

ئیبن تەیمیە لەسەرەتاکانی ژیانیەوە بەڵێنی بەخودا دابوو کە لەسەر قورئان پاداشتی دنیایی وەرنەگرێت، ئەو دەیوت:" بەڵێنم بە خودا داوە هیچ لەسەر قورئان وەرنەگرم"،بۆیە لەو بارەیەوە

---

١٤٨ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٧١.

١٤٩ – هـ.س، ل ٥٨–٥٩.

١٥٠ – الندوي: س.پ، ج٢، ل ٤٥٤.

١٥١ – بە وەرگرتن لە: العبادی: س.پ، ل ١٢.

هەرچیەکیان بۆ بخستایەتەڕوو وەرینەدەگرت، تەنانەت بارەکە گەشتبووە ئەوەی ئیبن تەیمیە بە دنیانەویستێکی وا ناوی بڕوات کە ئەگەر لە هەرکەسیان بپرسیایە کێ زیاترین وەلانانی ئارەزووەکانی دنیای بۆ دواڕۆژ گرتوەتەبەر، ئاماژە بە ئیبن تەیمیە دەکرا.١٥٢

دیارترین مامۆستاکانی ئیبن تەیمیە بریتیبوون لە:

شەهابەدینی باوکی.

ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم.

عەبدوڕەحمانی کوڕی موحەممەدی کوڕی قودامەی مەقدیسی.

ئەحمەدی کوڕی نیعمەتوڵلای کوڕی عەبدودائیمی مەقدیسی.

یەحیای کوڕی ئەبوو مەنسوری سەیرەفی.

زەینەبی کچی مەککی کوڕی عەلی حەڕانی.

موحەممەدی کوڕی عەبدولهادی کوڕی بەدرانی مرداوی.١٥٣

ئیبن تەیمیە هەر لەسەردەمی مامۆستاکانیدا ناوبانگی دەرکرد و لە ڕیزی یەکێك لە زانا دیاردەکاندا ناوی پەیداکرد، بەڵکوو لە مۆڵەتدانێکی (ئیبن شەهرەزووریدا)دەستنووسی ئیبن تەیمیەش هەبوو.١٥٤

١٥٢ – البزار: س.پ، ل٥٩٩.

١٥٣ – شلش: س.پ، ل٤٥–٤٦.

١٥٤ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٧٠؛ الحسامي: س.پ، ل ١٥.





گرنگترین ئەو زانستانەی ئیبن تەیمیە وەریگرتن بریتیبوون لە:

قورئانی پیرۆزو وانستەکانی.

فەرموودەو زانستەکانی.

تەفسیر.

بیرکاری.

زمانی عەرەبی.

بیروباوەڕ.

فیقهی شەریعەت.١٥٥

شارەزایی دەستەو کۆمەڵە ئایینیەکان.

زانستەکانی فەلسەفەو کەلام و مەنتیق.

مێژوو.١٥٦

کاتێك باوکی کۆچی دواییکرد، ئیبن تەیمیە تەمەنی بیست ویەك ساڵان بوو، لەجیاتی باوکی وانەی دەوتەوە و زانایانیش لە وانەکەیدا گوێبیستی دەبوون، بۆ نموونە لە وانەی یەکەمیدا پاش مردنی باوکی لە ڕۆژی دووشەممە دووی موحەڕەمی ساڵی (٦٨٣ك/١٢٨٤ز) لە (دار الحديث السكرية) دا وانەیەکی

١٥٥ – أبوزهرة: س.پ، ل٢٢.

١٥٦– عائض بن سعد الدوسري: هكذا تحدث ابن تيمية، ط١، المكتب الإسلامي، (بيروت–عمان:٢٠٠٧م)، ص٢٤٩.

پێشكەشكرد، تیایدا دادوەری دادوەران بەهائەدین یوسف و شەیخولئیسلام ئەبوومحەممەد عەبدوڕەحمانی فەزاری و شێخ زەینەدین عەمری كوڕی مەككی باوكی صەدرەدین، گەورەی حەنبەلیەكان زەینەدین ئەبولبەرەكاتی تەنوخی و چەندێكی تر ئامادەبون.[١٥٧]

هەروەها لە ڕۆژی هەینی (دەی صەفەری ٦٨٣ك) لە مزگەوتی ئومەوی لە دیمەشق دوای نوێژی هەینی وانەی تەفسیر وتنەوەی دەستپێكرد و ژمارەیەكی زۆر خەڵك ئامادەی بوون.[١٥٨]

ئیبن تەیمیە وانەی جۆراوجۆری دەوتەوە، بەڵام لەیەك خاڵدا یەكیاندەگرتەوە كە ئەویش ڕێڕەوی چوون بەرەو زیندووكردنەوەی پەیامی بەرەو هاوەڵان بوو لەبەشە جیاجیاكاندا، ئەو دەیویست ئیسلام بگێڕێتەوە بۆ سەر بنەڕەتەكەی خۆی و لە هەر خەوشێكی دەمارگیری یان لادان دووری بخاتەوە و سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی بكاتە پێشەنگ.[١٥٩]

لە خۆراكدا كەمخۆر بوو و بەهەر خواردنێك ڕازی دەبوو، دەگێڕنەوە دایكی خواردنێكی ئامادە كردووە، خواردنەكە باش

---

[١٥٧] – النعیمي: الدارس قي تأريخ المدارس، ط١، دارالكتب العلمية، (بيروت/١٤١٠هـ) ج١، ص٥٧.

[١٥٨] – الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٥١، ل١٢.

[١٥٩] – الكرمي: س.پ، ل٣٤٩–٣٥٠.





وەرنەچووەو خۆیشی نەیخواردووە، بەڵام ئیبن تەیمیە هاتەوەو لێی خوارد و هیچ گلەیی و گازەندەیەكی نەبوو.[١٦٠]

ئەوەی وای لە ئیبن تەیمیە كرد گرنگی زیاتر بەفەرموودە بدات، لەبەرئەوە بوو كە باوكی زانای فەرموودەناس بووە،تا ئەوەی ئیبن تەیمیە لە دووسەد مامۆستای فەرموودە وەرگرت و شارەزاییەكی باشی لە زانستی فەرموودەو (جرح و تعديل) دا پەیداكرد.[١٦١]

شێوازی وتاردان یان وانەوتنەوەی:

پاش تەواوبوون لە نوێژی هەینی، دوو ڕكات نوێژی كردووەو پاشان دانیشتووە[١٦٢]و بەمجۆرە دەستی بە وانەوتنەوەكەی كردووە:

سەلەواتدان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بە جۆرێك كە گوێگر لەو پیاهەڵدانە بەسەر پێغەمبەر(ﷺ) سەرسام دەبوو.[١٦٣]

لەسەر مەسەلەیەك قسەی دەكرد ئایەت و فەرموودەو وتەو بەڵگەی زانایانی دەهێنایەوە.

دەكەوتە شەن كەوكردنی وتەی زانایان و دیاریكردنی ڕاست وهەڵەكانیان.

---

[١٦٠] – الكتبي: س.پ، ج١، ل١٢٤.

[١٦١] – أبوزهرة: س.پ، ل٢١.

[١٦٢] – البزار: س.پ، ل٥٨٨.

[١٦٣] – الحسامي: س.پ، ل٢٦.

لەو نێوەندەدا شیعری بەکاردەهیناو دەیشیکردە بەڵگە.

کاتێك بابەتەکەی پێشکەش دەکرد، لە بارێکی وادا بوو وەك لەو شوێنەدا نەبێت و هەردوو چاوی دادەخست.١٦٤

هەرجارێك ناوی پێغەمبەر(ﷺ)ی بهێنایە صەلەواتی لەسەر دەدا.١٦٥

زۆر هەوڵی دەدا بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) فەتواو بڕیار بدات و دەیوت:"هەموو کەسێك قسە دەکات بەڵگە بۆ قسەکەی دێنێتەوە نەوەك بیکاتە بەڵگە، جگە لەخواو پێغەمبەرەکەی نەبێت".١٦٦

پاش تەواو بوونی وانەکە چاوەکانی دەکردەوەو بەڕوویەکی گەش و کراوەو دەم بەخەندەوە دەیڕوانیە خەڵکەکە.

ڕێژەی ئامادەبوان لە وانەکانیدا زۆر بون و زاناو سەرکردەو فەرموودەناس و فیقهناس و قورئانخوێن و ئەدیب و خەڵکی گشتیش تیایدا ئامادەبوون.١٦٧

گوێی لە پرسیاری خەڵك دەگرت و وەڵامی دەدانەوە.

١٦٤ – البزار: س.پ، ل٥٨٨.

١٦٥ – هـ.س، ل٥٨٩.

١٦٦ – الحسامي: س.پ، ل٢٧.

١٦٧ – البزار: س.پ، ل ٥٨٩.







ئەگەر هەستی بکردایە کەسێك لێهاتوو و بەتوانایە، هانیدەدا تا زیاتر لە زانستدا ڕۆبچێت.١٦٨

هەوڵیدەدا لە وتارەکەیدا شتی نوێ بڵێت و تازەگەریەك لە زانیاریدا ببەخشێت.١٦٩

بۆ تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆزیش بڕێك لە قورئانی پیرۆز دەخوێندرایەوە و ئەویش ڕاڤەی دەکرد.١٧٠

لە وتارو وانەکانیدا وەرەق و پێنوسی بەکارنەدەهێنا.١٧١

دیارترین خوێندکارەکانی بریتیبوون لە:

ئیبن قەییمی جەوزی.

ئیبن کەپیر.

ئیبن عەبدولهادی.

عومەری کوڕی بەزار.

یوسفی کوڕی زەکی.

ئەبوو موحەممەدی بەرزالی.

شەمسەدینی ژەهەبی.

ئەبولعەبباسی مەقدیسی.

١٦٨ – الحسامي: س.پ، ل٢٩.

١٦٩ – الصفدي: س.پ، ج٧، ل١٥.

١٧٠ – الحسامي: س.پ، ل٣٠.

١٧١ – أبوزهرة: س.پ، ل٢١.

عومەری كوڕی موزەفەری حەلەبی ناسراو بە (ئیبنولوەردی ).

ئەبوحەفص عومەری كوڕی سەعدوڵلای حەڕانی.[172]

ئیبن تەیمیە جگە لەزمانی سەرەكی خۆی بە چاكی زمانەكانی عیبری و عەرەبی و لاتینی و توركی دەزانی.[173]

ئەو حەزی نەدەكرد پۆستی دەسەڵات وەربگرێت، بۆیە كاتێك پۆستی دادوەری دادوەران و (مشیخة الشیوخ) گەورەی زانایانی بۆ پێشنیار كرا، ئامادە نەبوو وەریبگرێت.[174]

هەر لەتەمەنی هەرزەكاریدا بوو كە بەهۆی زیرەكی و لێهاتوویی و پاكیەتیەكەیەوە كەسانێك لەسەر دەستی موسڵمان بوون، لەوانە ئەو جوولەكەی كاتێك ئیبن تەیمیە دەچوو بۆ خوێندنگە لەسەر ڕێگەكەی بوو و پرسیاری لێدەكرد، ئیبن تەیمیەیش خێرا وەڵامی دەدایەوە، تا ئەوەی جوولەكەكە لەسەر دەستی موسڵمان بوو،[175] یان ئەو جوولەكەی كە موسڵمان بوو و دواتر بە (بهاءالدین المهذب) ناسرا،[176] چەند مەسیحیەكیش هەر لەسەرەتای تەمەنی ئیبن تەیمیەوە لەسەر دەستی باوەڕیان بە

---

[172]– شلش: س.پ، ل ٤٦–٥١.

[173]– هـ.س، ل ٥١.

[174]– ابن رجب: س.پ، ج٢، ل٣٢٣.

[175]– البزار: س.پ، ل٥٨٥" الحسامي: س.پ، ل٤٤.

[176]– ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٧٨.





ئیسلام هێنا، لەوانە (ئیبراهیمی كوڕی داوودی ئامێدی) كە لەسەر دەستی ئیبن تەیمیە هاتە ناو ئیسلام.[177]

ئیبن تەیمیە لە ماوەی زانستخوازیدا تووشی ئازارێك بووە و چوەتە لای پزیشك، پزیشكەكە پێی وتووە خۆت ماندوو مەكەو سەرقاڵی زانست و بیركردنەوە لە زانست و تاودانە زیكر مەكە، ئیبن تەیمیەش وتی: "مەگەر ئێوە ناڵێن كەسێك كە حەزەكەی دێتەدی، دەروونی بەهێز دەبێت و دەردەكەی لادەبات؟! دەی من كە دەنەومە زانست و بیركردنەوەو زیكر لەوپەڕی خۆشیدام، بەمە نابێت دەردەكەم بمێنێت".[178]

لەگەڵ ئەمانەشدا پەرستشی خوای لەڕووی نوێژوو نزاو ڕۆژووەوە لەبیر نەدەكرد، بەڵكو نوێژەكانی بە جەماعەت بە جێدەگەیاندو شەونوێژو قورئانخوێندنی هەبوو، نزای زۆریشی دەكرد، زیاترین نزایەكیش دەیكرد ئەوە بوو دەیوت: "خوایە سەرمانخەیت و كەسمان بەسەردا سەرنەخەیت...خوایە بە سوپاسگوزارو زیكربەدەممان بگێریت...خوایە تەوبەمان قبوڵ بفەرموو وهیدایەتی دڵەكانمان بدەیت".[179]

---

[177]– ابن حجر: الدرر الكامنة، ط٢ مجلس دائرة المعارف العثمانیة، (حیدرأباد/١٩٧٢م)، ج١، ص٢٦–٢٧.

[178] – ابن القیم: مفتاح دار السعادة، دارالكتب العلمیة، بیروت، ج١، ص٢٥٠.

[179] – الحسامي: س.پ، ل٥٦.

ئیبن تەیمیە لە وتەیەکیدا سەبارەت بە ژیکر دەڵێت: (ذیکر بۆ دڵ وەك ئاو بۆ ماسی وایە، دەی ماسی چۆن دەتوانێت بەبێ ئاو بژیت؟).١٨٠

---

١٨٠ – ابن القیم: الوابل الصیب، ط١، دارالکتاب العربي، (بیروت/١٩٨٥م)، ص٦٣.







# باسی سێیەم

# ( دادگاییکردنەکانی ئیبن تەیمیە و بەندکردنەکانی )

## تەوەرەی یەکەم: دادگاییکردنەکانی شام

پاش ئەوەی ئیبن تەیمیە بڕیاری گۆڕان و ئیجتهادی دا و توانی ڕۆڵێکی دیار ببینێت، ناو و ناوبانگێکی دەرکرد، بۆیە هەندێك لە فیقهناسان بەوە بێزاربوون و چەندێکی تریش ڕقیان لێهەڵگرت و هەوڵیاندا لە دژی کاربکەن، بۆ ئەمەش دەیانویست گومان لەسەر بیروباوەڕەکەی دروستبکەن،١٨١ بەڵام بەختی ئیبن تەیمیە لە دیمەشقدا ئەوە بوو کە:

پاڵپشتی خوایی لەگەڵدابوو و پەیوەندی خۆی لەگەڵ خوادا بەهێز دەکرد.١٨٢

کۆمەڵێك لە سەرکردە و دەسەڵاتدارەکان بەچاوی ڕێزو گەورەییەوە سەیری ئیبن تەیمیەیان دەکرد.١٨٣

جەماوەرێکی زۆر پاڵپشت و هەواداری ئیبن تەیمیە بوون و مۆرکێکی جەماوەری پێوە دیاربوو.١٨٤

---

١٨١ – أبوزهرة: س.پ، ل٢٨–٢٩؛ موسی: س.پ، ل٩٤.

١٨٢ – الحسامي: س.پ، ل٦١؛ موسی: س.پ، ل٩٦.

١٨٣ – ابن کثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٥؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٦٢.

١٨٤ – أبوزهرة: س.پ، ل٤٦.

کۆمەڵێك لە زانایان بەچاوی زاناو کەسی گەورە سەیری ئیبن تەیمیەیان دەکرد و پشتگیری بوون.١٨٥

بەڵام ئەمە نەبوویە ڕێگری هەوڵەکانی نەیارانی ئیبن تەیمیە تا ئەوەی لە شام و میسریشدا گومانیان لەسەر خۆیو بیرووباوەڕەکەی دروستکردو سەرەتاکانی ژیانی دادگایی وبەندیخانەی ئیبن تەیمیە دەستپێکرد.١٨٦

سەرەتا لە دیمەشقدا سێ کۆڕی دادگاییکردنی بۆ گیرا، بەڵام توانی لە هەر سێ دادگاییەکەیدا سەرکەوتووبێت و تۆمەتەکان بەرپەرچبداتەوە.

ئەوەی وایدەکرد سەرکردەکانی میسر بەچاوی گومان و خراپەوە بڕواننە ئیبن تەیمیە، ئەوەبوو کە ئەو لە شام دەژیا و لە سەرکردەکانی میسر دووربوو، زانایانی میسریش لەبەر بوونی ناوبانگی ئیبن تەیمییە یان چەقبەستوویی مەزهەبی و هزرییان، هەوڵیاندا وەك کەسێکی خراپ نیشانی سەرکردەکانی میسری بدەن، ئەویش لەوێ نەبوو تا وەڵامی ئەو گومانانە بداتەوەو سەرکردەکان بە زانست و دڵسۆزی خۆی ئاشنا بکات.١٨٧

١٨٥ – موسی: س.پ، ل٩٥.

١٨٦ – الکرمي: س.پ، ل٣٥٠،٣٥٨.

١٨٧ – أبوزهرة: س.پ، ل٤٦.







لەکۆتاییەکانی سەردەمی مەلیك مەنسور لاجین و لەساڵی (٦٩٨ك /١٢٩٩ز) دا کۆمەڵێك لە فیقهناسان بڕیاریاندا ئیبن تەیمیە ببەنە دادگای دادوەری حەنەفی(جەلالەدین)ەوە، بەڵام ئیبن تەیمییە ئامادەیی نەبوو، ئەوانیش کەوتنە بانگەشەکردن لەژدی، بەڵام یەکێك لە سەرکردەکان پاڵپشتی ئیبن تەیمییەی کرد و بارەکەی هێورکردەوە،١٨٨ دواتر ئیبن تەیمیە لەگەڵ ئیمامەدین دانیشت، پاش لێدوان لەسەر چەند بابەتێکی نووسینە بیروباوەڕییەکانی ئیبن تەیمیە و پۆسیار و وەڵامدانەوە، دەرکەوت کە لای نەداوەو ئەو تۆمەتانەی بەرەوڕووی کراونەتەوە ڕاست نین.١٨٩

بەڵام بارەکە بەمەوە نەوەستاو نەیارەکانی وازیان نەهێنا تا ساڵی( ٧٠٥ك/١٣٠٥ز) لە دیمەشق سێ کۆڕی دادگاییان بۆگرت و هەوڵیاندا بە هەرپێناوێك بێت تاوانباری بکەن،١٩٠ لە ڕۆژی دووشەممە ٨ی ڕەجەبی ساڵی(٧٠٥ك/١٣٠٥ز) یەکەم کۆڕی دادگاییکردنی ئیبن تەیمییە گیرا،١٩١ تۆمەتەکەش لەسەر ئەو نووسینە بوو کە ئیبن تەیمیە لە ساڵی(٧٠٤ك/١٣٠٤ز) ناردبووی

١٨٨ – ابن کثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٥.

١٨٩ – الکرمي: س.پ، ل٣٥٧.

١٩٠ – العبر فی خبر من غبر، ط٢، مطبعة حکومة الکویت، (کویت–١٩٨٤م)، ج٦، ص٣٠؛ ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٥٠؛ موسی: س.پ، ل٩٩.

١٩١ – ابن کثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٣٨.

بۆ ئەبولفەتح نەصر و تیایدا ڕەخنەی لە ڕاکانی ئیبن عەرەبی و خراپی بیرووباوەڕی و لە شەریعەت لادانی دەگرت، جگە لەوەی باسی لەبیروباوەڕو مەزهەبە لادەرەکانی ناو مەسیحیەتی دەکردو سەبارەت بە حلول(ئاوێتە بوون و ئیتحاد) کە لە ناو مەسیحیەتدا یەعقوبی و نستووری و ملکانی هەبوون و ئەمانەی لەگەڵ ڕافیزەو جوهەمیەو کۆمەڵێك لە سۆفیەکاندا بەراورد دەکرد.[192]

زاناو دادوەرەکان لەم دادگاییەدا ئامادەبوون و نوێنەری سوڵتانیش لە دیمەشق لەو کۆڕەدا بوو، پاش پرسیارکردن لەبیروباوەڕو ئەو قسانەی بەرەو ڕووی کرانەوە، ئیبن تەیمییە وەڵامی دانەوەو ئەوەی خستەڕوو کە بیروباوەڕی ئەو لە قورئان و سوننەت و ئیجماعی پێشووی ئوممەتەوەیە و جگە لەوەش هەرچییەك وتراوە ڕاست نیە.[193]

هەموو بیرووباوەڕی ئیبن تەیمییە لە لایەن کەماڵەددینەوە خوێندرایەوەو مشتومڕی لەسەرکرا، ئیبن تەیمیە بەرپەرچی ئەوەی دایەوە ئەمە تەنها ڕای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بێت، بەڵکو ڕای قورئان و سوننەتە، ئەمە واتای ئەوەیە پەیوەست بەدەمارگیری مەزهەبی نیە.[194]

---

[192] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٨٥–٤٨٨.
[193] – القطان: س.پ، ل٥٤.
[194] – الحسامي: س.پ، ل٣٠٣.







ئیبن تەیمیە وتی:"هەر قسەیەك هێناومە، ئامادەم سێ ساڵ مۆڵەت بە هەرکەس بدەم، بزانێت لەماوەی سێ سەدەی یەکەمی ئیسلامدا شتێك هەبوو لەگەڵ ئەمەدا نەگونجێت، من ئامادەم پەشیمان ببمەوە"،[195] ئەمەش کاریگەرییەگی زۆرتری لەسەر ئامادەبوان هەبوو و کۆڕی یەکەمی دادگاییەکە کۆتایی پێهات.[196]

دانیشتنی دووەم لە ڕۆژی هەینی (١٢ی ڕەجەب)ی هەمان ساڵدا بەستراو چەندین زانا ئامادەبوون،[197] پاش پرسیارکردن لە ئیبن تەیمیەو گوێگرتن لەوەڵامەکانی، بڕیاریان دا زەمەلکانی بەبێ چاوپۆشی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات، دواجار ڕەزامەندی لەسەر بیروباوەڕی واسگی ئیبن تەیمیە دەربڕی.[198]

سەفیەدین ڕەخنەی لەزاناکان گرت کە ئەوان لەسەر بنەمایەکی وا دادگایی ئیبن تەیمیە ناکەن و ئەوەی ئەو

---

[195] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٥٦.
[196] – ه.س.
[197] – ابن کثیر: س.پ، مج٧،ج١٤، ل٣٩.
[198] – النویري: س.پ، مج١٥ج٣٢، ل٨٠؛ الصفدي: س.پ، ج٧، ل١٦؛ ابن کثیر: س.پ، مج٧،ج١٤، ل٣٩.

دەیلێت ڕایەکی جیاوازە کە هاتووە و هەردوو ڕاکە دوو وتەی جیای ئەشعەری بوون، ئێوە دەڵێن با تەئویلکردن هەبێت، ئەویش دەڵێت با نەبێت، هەردوو ڕاکە بۆ ئەشعەری دەگەڕێنەوە.[١٩٩]

دواتر چەند زانایەکی حەنەفی هاتن بۆ لای و وتیان ئەگەر بتوتایە ئەوە ڕای مەزهەبی ئەحمەدە ڕزگارت دەبوو، ئەویش وتی: "نا! سوێند بەخوا ئەمە بەس ڕای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نیە، بەڵکوو بیروباوەڕی پێشینەی ئوممەت و زانایانی فەرموودەیەو هەرچییم وتبێت ئایەت یان فەرموودە یان ڕایەکی ئیجماع(یەکدەنگ) ی پێشینەی لەسەرە"،[٢٠٠] بەوجۆرە لە دادگایی دووەمیش ڕزگاری بوو.ئیسلام، پاشان لە حەوتی شەعبانی هەمان ساڵ لە کۆشکی دەسەڵاتدا دادگایی سێیەمی بۆ گیرا و پاش قسەکردن لەسەر بیروباوەڕەکەی، هەموان لەسەر ڕاستی بیروباوەڕی یەکدەنگ بوون.[٢٠١]

---

[١٩٩] – الحسامي: س.پ، ل٣٠٤-٣٠٥.

[٢٠٠] – ابن تيمية: مجموعة الفتاوى، ط٣، دار الوفاء، (القاهرة/٢٠٠٥م)، ج٣ص١٨٩؛ ابن عبدالوهاب: س.پ، ص١٦٤.

[٢٠١] – القطان: س.پ، ل٥٥.





بەڵام لە هەمان ساڵدا بە هاندانی زانایانێکی ناو میسر، سوڵتان لە پێنجی ڕەمەزاندا نامەیەکی بۆ دیمەشق نارد و داوایکرد تا ئیبن تەیمیە و دادوەر (ئیبن صەصرەی) بچن بۆ میسر،[٢٠٢] والی داوای لە ئیبن تەیمیە کرد تا نەچێت بەڵکوو خۆی نامە بۆ سوڵتان دەنێرێت و بارەکەی تێدەگەیەنێت، بەڵام ئەو بڕیاریدا بەرەو میسر بەڕێ بکەوێت،[٢٠٣] بۆیە بەڕێکەوت و جەماوەرێکی زۆر چوون بۆ ماڵئاوایی لێکردنی و گریان خەڵکەکەی گرتەوە، ئەمەش ئاستی جەماوەریبوونی ئیبن تەیمیە نیشاندەدات.[٢٠٤]

---

[٢٠٢] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٠؛ ابن بدالوهاب: س.پ، ل١٦٦؛ الكرمي: س.پ، ل٣٦١.

[٢٠٣] – أبوزهرة: س.پ، ل٤٧.

[٢٠٤] – الكرمي: س.پ، ٣٦١؛ ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٦٧.

## تەوەرەی دووەم: (دادگاییی کردنەکانی میسر)

پاش ئەوەی ئیبنولئەفرەمی والی شام سەرەتا ئامادە نەبوو ئیبن تەیمیە بنێرێت بۆ میسر، لەلایەن سوڵتانی میسرەوە هەڕەشەی لێکرا، بۆیە بۆ جاری دووەم ئامادەیی هەبوو،[٢٠٥] بەڵام پێش ئامادەیی ئەو ئیبن تەیمیە خۆی بڕیاریدا بچێت.[٢٠٦]

عەللامە نوەیری باس لە هۆکاری بانگکردنی ئیبن تەیمیە بۆ میسر دەکات و دەڵێت: "لەگەڵ شەمسەدینی کەنانی لە خوێندنگەی ناسریە پێکەوە بوین، لەو کاتەدا یەکێك لە خوێنکارەکان بە ناوی عەبدوڕەحمان عینوسی هات و کۆمەڵێك فەتوای ئیبن تەیمیەی پێبوو، مەبەستی ئەو بەرامبەر بە ئیبن تەیمیە دڵسۆزی بوو نەوەك خراپە، کاتێك شەمسەدین فەتواکانی خوێندەوە لە هەندێکیان ناڕازی بوو و خێرا نیشانی دادوەری دادوەران زەینەدینی مالیکی دا، ئەویش وتی پێویستە بیسەلمێنم کە ئەوە دەستنووسی خودی ئیبن تەیمیەیە، بەیانی کە کۆمەڵێك کەس شایەتی دەستنووسەکەیاندا، زەینەدین لەگەڵ سەرکردەکان کۆبوویەوەو ناڕەزایی خۆی لەو فەتوایانە دەربڕی".[٢٠٧]

---

٢٠٥ – النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل٨٠؛ الحسامي: س.پ، ل٣١٥-٣١٦.
٢٠٦ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٦٧.
٢٠٧ – النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل٧١-٧٩.







ئەو ماوەشدا پەیوەندی نێوان نەسری منبجی و جاشنگیر زۆر بەهێز بوو،[٢٠٨] منبجیش نەیارێکی توندی ئیبن تەیمیە بوو، بۆیە کەوتە هاندانی زیاتری دادوەری دادوەران زەینەدینی مالیکی، پاشان پەیوەندی بە سەرکردەکانەوە کرد تا گەشتە لای سوڵتان و وای نیشاندا ئەو ڕۆڵەی ئیبن تەیمیە دەیبینێت تەنها لەمەسەلە ئایینیەکەدا ناوەستێت، بەڵکوو مەترسی بۆ دەسەڵاتی ئەویش دەبێت و هەمان ڕۆڵی ئیبن تۆمرت دەبینێت، بەمە جاشنگیر لە دەسەڵاتی خۆی ترساو باری ئیبن تەیمیە بەرەو خراپتر چوو، لێرەوە دەردەکەوێت کە ڕۆڵی کارای دژایەتی ئیبن تەیمیە لەدەست نەسربی منبجی و زەینەدینی مالیکیدا کۆدەبێتەوە.[٢٠٩]

ئیبن تەیمیە لە دیمەشقەوە لە(١٢ی ڕەمەزانی٧٠٥ك.)دا کەوتەڕێ[٢١٠] و لە ڕۆژی شەممە گەشتە شاری غەززەو لەوێ لە مزگەوتی گەورەیدا کۆڕێکی گەورەی گرت[٢١١] و لە پێنج شەممە بیست ودووی ڕەمەزانی ساڵی(٧٠٥ك/١٣٠٥ز)دا گەشتە قاهیرە.[٢١٢]

---

٢٠٨ – الكرمي: س.پ، ل٣٦٠-٣٦١.
٢٠٩ –الحسامي: س.پ، ل٣١٢-٣١٣.
٢١٠ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٦٧؛ الكرمي: س.پ، ل٣٦١.
٢١١ – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٠؛ ابن عبدالوهاب: س.پ، ل ١٦٧؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٩٠.
٢١٢ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٦٧؛ الكرمي: س.پ، ل٣٦١.

دوای نوێــژی هــەینی دادوەران و گەورەبەرپرســان لــە قــەڵا کۆبوونەوە، ئیبن تەیمیە ویستی قسە بکات، بەڵام ڕێی پێنەدراو لەبەرامبەردا ئیبن مەخلووفی مالیکی کەوتە ڕەخنە لێگرتنی، دادوەریش بە ئیبن تەیمیەی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ ئەویش بە سوپاسی خوا دەستیپێکرد، یەکسەر قسەکەیان پێبڕی و وتیان لە جێی وتار وەڵام بدەرەوە، ئەویش وتی: مەگەر کێ دادگایی من دەکات؟ وتیان: دادوەری مالیکی، ئەویش وتی: چۆن دەکرێت کەسێکی نەیارم دادگاییم بکات؟! بەمە دادوەر تووڕە بوو و بەبێ گوێلێگرتنی بڕیاری بەندکردنی خۆی و شەرەفەدین و زەینەدینی برای درا،[٢١٣] شەرەفەدینی برای هاواری بۆ لای خوا بردو نزای لێکردن، بەڵام ئیبن تەیمیە ئاماژەی بۆ کرد کە نزا لەدژیان نەکات.[٢١٤]

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە بورجدا بەندکراو دواتر لە شەوی چەژنی ڕەمەزاندا برا بۆ ئەو بەندیخانەی ناسرابوو بە (جب)*.[٢١٥]

---

[٢١٣] – النویری: س.پ، مج١٥ج٣٢، ل٨١.

[٢١٤] – موسى: س.پ، ل١٠٤.

* – بەندیخانەیەکی تاریك و خراپ و وێرانەو بۆن ناخۆش بوو کە مەنسور قلاون لە ساڵی(٦٨١ك/١٢٨٢ز) دروستیکردبوو. (الحسامي: س.پ، ل٣١٩).

[٢١٥] – النویري: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل٨١-٨٢.







لەگەڵ ئیبن تەیمیەدا شەرەفەدین و زەینەدینی براشی بەندکران،[٢١٦] ئیبن تەیمیە لە گلەییەکیدا لەبارەی بەندیخانەکەوە دەڵێت: "مەسیحیەکان لە بەندیخانەیەکی چاکدان، لە کاتێکدا هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن و تیایدا کڵێسا دادەمەزرێنن، بریا بەندیخانەکەی ئێمەش لەوەی مەسیحییەکان بوایە، ئەوان ڕێزیان لێدەگیرێت و ئێمەش سووکایەتیمان پێدەکرێت، ئایا هەرکەس بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت دەڵێت پێغەمبەری خوا فرمانی بە شتی وا کردووە؟!"[٢١٧]

بارەکە لەمەشدا نەوەستا و بڕیاری قەدەغەکردنی فەتواکانی ئیبن تەیمیەو لێدانی هەوادارانی دەرچوو ،[٢١٨] دژایەتییەکی توندی حەنبەلییەکانی میسریش کرا.[٢١٩]

بەڵام گرتنی ئیبن تەیمیە دەنگیدایەوەو کاریگەری دروستکرد، بۆیە میر سەیفەدین سەلاری جێگیری میسر بەوە ناڕەحەت بوو و لەشەوی جەژندا سێ دادوەری مەزهەبەکانی شافیعی و مالیکی و حەنەفی و چەند زانایەکی فیقهناسی بانگکرد، لەوانە باجی و جوزەری و نەمراوی تا بڕیاری ئازادکردنی ئیبن تەیمیە بدەن،

---

[٢١٦] – النویري: س.پ، مج١٦،ج٣٢، ل٨١-٨٢.

[٢١٧] – ابن تیمیة: مجموع الفتاوی، ج٣، ل٢٥٤.

[٢١٨] – موسى: س.پ، ص١٠٤.

[٢١٩] – ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٠؛ موسى: س.پ، ل١٠٥.

بەڵام ئەوان مەرجیان دانا کە دەبێت ئیبن تەیمیە لە چەند بیروباوەڕێکی خۆی پاشگەز ببێتەوە، شەش جار چوون بۆلای، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو مەرجەکەیان قبوڵ بکات، بۆیە لە بەندیخانە مایەوەو هەوڵەکەی میر سەلار سەرینەگرت.[220]

لە٢٧ی ذیلحەججەی ساڵی(٧٠٦ك/١٣٠٦ز) دا شەرەفەدین و زەینەدینی برایانی ئیبن تەیمیە بران بۆ لای سوڵتان سەلار و ئیبن مەخلوفی مالیکی هات، مشتومڕێکی درێژخایەن لە نێوانیاندا بەڕێوەچوو، تیایدا شەرەفەدین بەبەڵگەوە قسەی لەسەر چەند هەڵەیەکی ئیبن مەخلووف کرد.[221]

لە ٢٨ ی هەمان مانگدا نامەیەکی ئیبن تەیمیە گەشتە دیمەشق و نامەکە گەشتە دەست والی دیمەشقیش، ئەویش نامەکەی خوێندەوەو دواتر بۆ خەڵکی باسکرد و کەوتە وەسفکردنی ئیبن تەیمیە.[222]

لە ڕۆژی هەینی لە ١٤ی سەفەردا بەدرەدین ئیبن جەماعی دادوەری دادوەران لەگەڵ ئیبن تەیمیە دانیشت و قسەیەکی زۆر لە نێوانیاندا کرا و لەئەنجامدا ئیبن تەیمیە ئامادە نەبوو لە بەندیخانە بچێتە دەرەوە.[223]

---

[220] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل ١٦٧؛ الكرمي: س.پ، ل ٣٦٢.
[221] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٥.
[222] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٦٨.
[223] – ابن كثير: س.پ، ج١٤، ل٤٧؛ الكرمي: س.پ، ل٣٦٢؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل ٥٠١.





بۆ ڕۆژی هەینی دواتر لە(٢٣ی ڕەبیعولئەوەل) دا میر حسامەدین مەهنای کوڕی عیسا هات بۆ بەندیخانە و سوێندی ئیبن تەیمیەی دا کە دەبێت بێتەدەر و بچن بۆلای سەلار، لەوێ فیقهناسان ئامادەبوون و کەوتنە مشتومڕ لەسەر چەند بابەتێك، لە ڕۆژی یەکشەممە سەلار بەدەقێکی سوڵتانی دادوەرەکانی بانگکرد تا ئامادەبن، بەڵام هەریەکەیان بیانوویەکی هێنایەوە و هیچکام نەهاتن چونکە ترسان لەبەردەم زانست و وەڵامی ئیبن تەیمیەدا شکستبخۆن و بەوە شوێنپێیان لەق بێت، ئەویش گوێی لە پۆزشەکانیان گرت و بڕیاری ئازادکردنی ئیبن تەیمیەشی دەرکرد،[224] داواشی لە ئیبن تەیمیە کرد تا لە میسر بمێنێتەوە و لەوێ وانە بڵێتەوە، ئەویش بە شێوەی کۆڕگرتن لە مزگەوت و لە خوێندنگەکانیشدا وەك خوێندنگەی سالحیە وانەی دەوتەوەو ناوی لەناو خەڵکدا بڵاوبوویەوە.[225]

پاش ئازادبوونی نامەیەکی بۆشام نارد و هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە نەیارانی دەربڕی و تیایدا وتی:"خواتان لێ ڕازی بێت، ئێوەدەزانن من حەز ناکەم هیچکام لە موسڵمانان ئازار بچێژن، چ جای هاوڕێ و دەوروبەرەکانمان، من هیچ گلەیی و گازەندەیەکم لێیان نیە، بەڵکوو بەڕێزوو گەورەیی سەیریان دەکەم، هەریەکەو بە پێی خۆی، هەرکام لەوانەش یان

---

[224] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٧؛ أبوزهرة: س.پ، ل٥١.
[225] – الحسامي: س.پ، ل٣٢٦–٣٢٧.

ئیجتهادی کردووە یان هەڵەی کردووە یان تاوانبارە، ئەگەر ئیجتهادەکەیەو پێکاویەتی، ئەوا پاداشتی هەیەو سوپاسیشی دەکرێت، ئەگەریش نەیپێکاوە ئەوە پاداشتی هەیەو لە نەپێکانی چاوپۆشی دەکرێت، ئەگەریش تاوانبارە بەڵکوو خوا لە ئێمەو هەموو باوەڕداران خۆش بێت، حەز ناکەم هیچکەس بەهۆی درۆکردن یان ستەم یان دوژمنکاری لە ڕوومدا زەلیل بکرێت، چونکە من گەردنی هەموو موسڵمانێکم ئازاد کردووە و چیم پێخۆشە بۆ ئەوانیش پێمخۆشە، ئەوانەش درۆو ستەمیان لێکردوم، لەلایەن منەوە گەردنیان ئازاد بێت".[226]

هەروەها نامەیەکیشی بۆ دایکی نارد و تیایدا سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕی، پاشان داوایکرد مۆڵەتی پێبدات تا ماوەیەك لە میسر بمێنێتەوە و بانگەواز بۆ ئاینی خوا بکات.[227]

---

[226] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٠٢؛ أبوزهرة: س.پ، ل٥٣.

[227] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٧٠–١٧٢؛ القطان: س.پ، ل٥٩.





## بەندکردنی دووەمی ئیبن تەیمیە لە میسر:

ئیبن تەیمیە پاش ئەوەی لە بەندیخانەی یەکەمی ئازادکراو مۆڵەتی وانەوتنەوەی پێدرا، کەوتە خستنە ڕووی بیروڕاکانی خۆی و بۆ ماوەی شەش مانگ لە وانەوتنەوەدا بەردەوام بوو.[228]

یەکێك لەو لایەنانەی ئیبن تەیمیە زۆر ئیشی لەسەر دەکرد، بریتیبوو لە هێرشبردنە سەر لادانەکانی سۆفیگەرایی وەك بیروباوەڕی وەحدەتولوجودو ئیتحادو ئاوێتەبوون (حلول) کە بە شێوەیەکی فراوان لە میسردا بڵاوبوویەوە، بە تایبەتی کاریگەری ئیبن فارچی شاعیری سۆفی میسری دیار بوو، بۆیە ئیبن تەیمیە لە دژیان وەستا، لەمەشدا هێرشی زیاتری بۆ سەر ئیبن عەرەبی بوو.[229]

سۆفیەکان ئەمەیان پێ قبوڵ نەکرا و بە کۆمەڵ هاتن بۆ لای سوڵتان، ئەویش فرمانی دەرکرد تا دانیشتنێك بۆ ئیبن تەیمیە ببەستن.[230]

لە ڕۆژی سێشەممە و لە دەرۆژی یەکەمی مانگی شەوالی ساڵی(٧٠٧ك/١٣٠٨ز) دا دانیشتنێکی بۆ بەسترا،[231]

---

[228] – القطان: س.پ، ل٦٠.

[229] – أبوزهرة: س.پ، ل٥٥؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٠٥.

[230] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٧٦.

[231] – الكرمي: س.پ، ل٣٦٤.

ئینجا بڕیاردرا بینێرن بۆ شام تا ئیبن عەتای نووسەری كتێبی (الحكم) و نوێنەری سۆفیەكان بوو سكاڵای بردە لای سەركردەكان.[232]

كۆتا بڕیار ئەوەبوو كە دەبێت ئیبن تەیمیە بچێت بۆ دیمەشق یان بەچەند مەرجێك لە ئەسكەندەریە بێت یان بەندیخانە هەڵبژێرێت، ئەویش بەندیخانەی هەڵبژارد، بەڵام دەوروبەرەكەی تكایان لێكرد بچێت بۆ دیمەشق، ئەویش تكاكەی وەرگرتن و لە ١١ی شەوالی(٧٠٧ك/١٣٠٨ز) دا بەرەو دیمەشق كەوتەڕێ،[233] بەڵام لەهەمان ڕۆژدا گەڕێندرایەوە بۆ میسر و برا بۆ بەندیخانە،[234] ئەمجارەیان مۆڵەتی پێدرا تا كەسێك لە گەڵیدا بێت و خزمەتی بكات،[235] دووبارە لەگەڵیشیدا زەینەدینی برای بەندكرا، ئەویش دەرفەتی پێدرا كەسی لەگەڵدا بێت تا خزمەتی بكات.[236]

خەڵكی گشتی و زانایان و كەسایەتیە دیارەكان سەردانی ئیبن تەیمیەیان دەكردو ڕقوكینەیان بەرامبەری نەدەما،[237]

---

[232] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٧؛ القطان: س.پ، ل٦١؛ الحسامي: س.پ، ل ٣٢٨-٣٢٩.

[233] – الكرمي: س.پ، ل٣٦٥.

[234] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٧٧.

[235] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٨.

[236] – الحسامي: س.پ، ل٣٣٥-٣٣٦.

[237] – محمد يوسف: س.پ، ل ١٠٦.







ئەویش لە وتنی بیروڕای خۆی ترس و دوودڵی نەبوو، بۆیە جارێكیتر لە خوێندنگەی صالحیە دلنیشتنی بۆ كرا وگەڕایەوە بۆ وانەوتنەوەی خۆی.[238]

لەكاتی بەندبوونەكەیدا شەمسەدین دبهاتی هات تا نێوانی لەگەڵ منبجیدا چاك بكاتەوە، چەند مەرجێكی بۆ هەردوولا دانا، سەرەتا هەردوو لا ئامادەییان دەربڕی، بەڵام دواتر كە ئیبن تەیمیە ئیمزایكرد، منبجی خۆی دوورگرت وئامادەنەبوو، بۆیە دبهاتی ڕاستیەكەی بۆ دەركەوت و بەڕقەوە منبجی بەجێهێشت.[239]

پاشان ئیبن تەیمیە دوورخرایەوە بۆ ئەسكەندەریە، ئەمەش لە كۆتا ڕۆژی مانگی سەفەری ساڵی (٧٠٩ك/١٣١٠ز) دا بوو،[240] لەوێ لە بورجێكی فراوان وپاك وخاوێندا بوو، دوو پەنجەرەی هەبوو كە یەكێكیان ڕووبەڕووی دەریاو ئەویتریش ڕووبە شاربوو، لەو ماوەیەدا خەڵكی سەردانیان دەكرد.[241]

لەو ماوەیەدا هەواڵ بڵاوبوویەوە كە ئیبن تەیمیەیان كوشتووە، ئەم هەواڵە پاش دوانزە ڕۆژ گەیشتە شام و خەڵكی دڵتەنگ بوون.[242]

---

[238] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٤٨.

[239] – الحسامي: س.پ، ل٣٣٣-٣٣٤.

[240] – القطان: س.پ، ل٦٣.

[241] – ابن كثير: س.پ، ج١٤، ل٥٢.

[242] – الكرمي: س.پ، ل٣٦٥.

لەو ماوەشدا تەدمووریەکان* هەوڵی زۆریان دا تا ئیبن تەیمیە ئازاد بکەن، بەڵام هەوڵەکەیان سەرینەگرت، چونکە پیاوانی دەوڵەت بە وتەکانی ئیبن تەیمیە ڕازینەبوون، ئەویش کە داواکانی دەسەڵاتدارانی لە دەمی تەدموریەکانەوە بیست، توڕەبوو و سوێندی خوارد کە دەوڵەتەکەی جاشنگیر دەڕووخێت، وتیشی: "کوژرانم شەهیدیەو دوورخستنەوەم کۆچکردنەو ئەگەر دوورمخەنەوە بۆ قوبرسیش من بانگەوازی خەڵکەکەی بۆ لای خوا دەکەم و ئەوانیش دێن بە دەممەوە، ئەگەریش بمگرن نشینگەمە". [243]

سوڵتان ناسر توانی لە جەژنی ڕەمەزانی ساڵی(٧٠٩ك١٣١٠ن) دا بێتە میسرو جاشنگیر لاببات، ئەمەش جاری سێیەمی وەرگرتنی دەسەڵاتی بوو. [244]

خێرا ئیبن تەیمیەی لە ئەسکەندەریەوە گەڕاندەوە، بۆ ئەمەش دوای دوو ڕۆژ لە دەسەڵات وەرگرتنی، خۆی چوو بۆ لای ئیبن تەیمیە و دەستیانکردە ملی یەکتر و ماوەیەك پێکەوە قسەیانکرد و دووبارە خەڵکی لە دەوری ئیبن تەیمییە کۆبوونەوە، [245] سوڵتان

* - مەبەست خەڵکی شاری تەدموورە، ئەوانەی هەواداری ئیبن تەیمیە بوون.
[243] - الحسامي: س.پ، ل٣٣٧-٣٣٩.
[244] - النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل١١٠-١١٦؛ ابن العماد: س.پ، ج٦، ل١٥٨.
[245] - الكرمي: س.پ، ل٣٦٦؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل٥١٠-٥١١.







داوایکرد تا نەیارەکانی ئیبن تەیمیە بکوژێت، بەڵام ئەو ڕازینەبوو، [246] ئەوکات ئیبن مەخلووف وتی: "ئێمە دژی ئیبن تەیمییە کارمانکرد، بەڵام ئەو تۆڵەی نەسەندەوە". [247]

[246] - ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٨٣.
[247] - ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٥٧؛ الحسامي: س.پ، ل٣٨٨.

# تەوەرەی سێیەم:
# (بەندکردنی ئیبن تەیمیە لە دیمەشق)

لەو ماوەیەدا باری خەڵکی شام باش نەبوو، بەتایبەت یەکێك لە سەرکردەکان بەناوی (سەیفەدین کرای) ستەمی زۆری لەخەڵك دەکرد، ئیبن تەیمیە کە ئەمەی بیست، چوویە لای سوڵتان و داوای لێکرد ئەو کەسە بگۆڕێت،[٢٤٨] جگە لەمەش داوایکرد کە ئیبنولئەفرەمی جێگری دیمەشق بگوازێتەوە بۆ تەرابلوس، ئەویش بەگوێیکرد.[٢٤٩]

لە میسر ئیبن تەیمیە کەوتەبەر هەڵمەتی جەماوەرێکی نەیاری، هەوادارانی ویستیان تۆڵەی بکەنەوە، بەڵام ئەو ئەترسا جەنگێکی کۆمەڵایەتی و ناوخۆیی لێبکەوێتەوە، بۆیە ڕێی پێنەدان، تا دواتر ئازاردەرەکانی پەشیمان بوونەوە، ئەم کارە لە ناوەڕاستی مانگی ڕەجەبی ساڵی(٧١١ك/١٣١٢ز) دا دووبارەبوویەوە.[٢٥٠]

لەڕۆژی چوارشەممە سەرەتای مانگی ذیلقەعدە و پاش حەوت ساڵ و حەوت هەفتە دووری لە دیمەشق، بە هاودەمی سوڵتان چوو بۆ دیمەشق و خەڵکی بۆ پێشوازیلێکردنی بە پیریەوە هاتن، پاش ماوەیەك لەوێ دەستیکردەوە بە کاری بانگەزو چەندین کتێبی نووسی.[٢٥١]

---

٢٤٨ –الحسامي: س.پ، ل٣٩٠-٣٩١.
٢٤٩ – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٦٣.
٢٥٠ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٨٥-١٨٦.
٢٥١ – الكرمي: س.پ، ل٣٦٨.







یەکێك لەو شتانەی کە ئیبن تەیمیە بڕیاری لەسەردا، بریتیبوو لە باسوخواسی تەڵاق، ئەو بە جیا لەڕای چوار مەزهەبەکە(شافیعی، حەنبەلی، مالیکی، حەنەفی)فەتوای دەرکرد کە سێ تەلاق بەیەکجار ناکەوێت،[٢٥٢] هەروەها فەتوای سوێندی تەلاقیشی دەرکرد،[٢٥٣] تائەوەی پاش ئامۆژگاری شەمسەدینی حەنبەلی بۆ ئیبن تەیمیەو ڕازیبوونی ئەویش بەئامۆژگاریەکە،[٢٥٤] بڕیاری سوڵتانی دەرچوو کە نابێت جارێکیتر ئیبن تەیمیە لەو بوارەدا فەتوا بدات،[٢٥٥] بەڵام پاش ماوەیەك ئیبن تەیمیە لەوبارەوە قسەیکرد،[٢٥٦] لەسەر ئەوەش لە پێنج شەممە ٢٢ی ڕەجەبی ساڵی(٧٢٠ك/١٣٢١ز) دا کۆڕێکی بۆ بەستراو دەسەڵاتدار و دادوەران و چەند موفتیەك تیایدا ئامادەبوون و بڕیاری گرتنی ئیبن تەیمیەیان دەرکرد،[٢٥٧] ماوەی پێنج مانگ و هەژدە ڕۆژ لە بەندیخانە هێشتیانەوە تا دواتر بە بڕیاری سوڵتان لە دووشەممەو لە ڕۆژی عاشووورای ساڵی(٧٢١ك/١٣٢٢ز) دا ئازادکرا و سەرلەنوێ دەستیکردەوە بە وانەوتنەوە.[٢٥٨]

---

٢٥٢ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢٠٢.
٢٥٣ – الندوي: س.پ، ج٢، ل ٥١٧-٥١٨.
٢٥٤ – الحسامي: س.پ، ل٤٠٠.
٢٥٥ – النويرى: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل٢٥٤.
٢٥٦ – الكرمي: س.پ، ل ٣٧١.
٢٥٧ – النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل٢٥٤.
٢٥٨ – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢٠٣.

کۆتا گیرانی ئیبن تەیمیە لەسەر فەتوای چوونە سەرقەبران بوو، ئەو دەڵێت چوون بۆ سەر گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان بە تایبەت و تەنها بۆ ئەومەبەستە دروست نیە، بەڵام ئەگەر نیازێکی ترت هەبێت و لەوێشەوە ئەوەش بکەیت ئەمەیان سوننەتە،[259] ئەم فەتواشی لە ساڵی(٧٠٩ك/١٣١٠ن) دا دەرکردبوو، بەڵام لە ساڵی(٧٢٦ك/١٣٤٤ن) دا ئەو باسوخواسەیان لەسەر زیندووکردەوە،[260] دادوەری دادوەران ئیبن جوملە دەقی فەتواکەی ئیبن تەیمیە ی گۆڕی و لە ڕۆژی دووشەممەو لەکاتی عەسرو لە ١٦ی شەعبانی ساڵی (٧٢٦ك/١٣٤٤ن) دا گیرا و هۆڵێکی چاك و پێویستی بۆ دابینکرا و براکەشیان لەگەڵدا برد تا خزمەتی بکات.[261]

ئیبن تەیمیە لەو ماوەیەدا کەوتە پەرستش و نووسین،[262] سکاڵاکانی زانایانی شام و بەغداد بۆ لای سوڵتان بران تا ئیبن تەیمیە ئازاد بکرێت، بەڵام سوودێکی وایان نەبوو و لە بەندیخانەدا هێشتیانەوە.[263]

---

[259] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٢٦.
[260] – القطان: س.پ، ل٧٠؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٢٠–٥٢٢.
[261] – الحسامي: س.پ، ل٤٠٨–٤١١.
[262] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٢٤.
[263] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢١٢–٢٢٠.







لەوماوەیەدا و لە ڕۆژی چوارشەممە ١٤ی جەمادیلئولای ساڵی(٧٢٧ك/١٣٤٥ن) دا شەرەفەدینی برای مرد، ئیبن تەیمیە خۆی نوێژی لەسەر کرد،[264] دواتر لەبەر کاریگەری زۆری ئیبن تەیمیە لە دووشەممەی ٩ی جەمادولئەوەلی ساڵی (٧٢٨ك /١٣٤٦ن) دا کتێب و وەرەق و پێنووسی لێدوورخرایەوە تا نەنووسێت،[265] ئەویش ئەمجار بە خەڵوز دەینوسی،[266] بەڵام لەوەشدا ڕێگری لێکرا، بۆیە گرنگی خۆی بە نوێژو پەرستش و قورئانخوێندن دا و تا هەشتاویەك خەتمی قورئان چوو، کە کۆچی دواییکرد هەندێك لە خەتمی هەشتاو یەکەمی مابوو،٢٦٧ زەینەدینی برای کە لەگەڵیدا بوو دەڵێت:"لە دە ڕۆژدا خەتمێکی دەکرد"،٢٦٨ لەو بەندیخانەدا ئیبن تەیمیە نەخۆشکەوت و بەو نەخۆشیەوە مرد.٢٦٩

---

[264] – ابن العماد: س.پ، ج٦، ل٢٣٦–٢٣٧.
[265] – الجزري: س.پ، ج٢، ل٢٦٣–٢٦٤؛ ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣٦.
[266] – ابوزهرة: س.پ، ل ٧٥؛ الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٢٥–٥٢٦.
[267] – النويرى: س.پ، مج١٦، ج٣٣، ل٢١٠.
[268] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢٢٦.
[269] – الحسامي: س.پ، ل٤٣٤–٤٣٥.

# باسی چوارەم

# مردنی ئیبن تەیمیەو وتەی ناوداران لەسەری

## تەوەرەی یەکەم: (مردنی ئیبن تەیمیە)

ئیبن تەیمیە لە دوایەمین جاری گرتنی لە دووشەممە ١٦ی شەعبانی ساڵی(٧٢٦ك/١٣٤٤ز) دا گیرا[٢٧٠] و لە بەندیخانە مایەوەو ئازادنەكرا تا ئەوەی لە ساڵی(٧٢٨ك/١٣٤٦ز) لە بەندیخانەدا كۆچی دوایی كرد.[٢٧١]

لە ساڵی(٧٢٧ك/١٣٤٥ز) شەرەفەدینی برای لە بەندیخانەدا مرد، ئەحمەدی برای نوێژی لەسەركردو مەراسیمێكی گەورەی بۆ گێردرا.[٢٧٢]

ئیبن تەیمیە چەند ڕۆژێك پێش مردنی تووشی نەخۆشی بوو،[٢٧٣] نەخۆشیەكەی بیست ڕۆژی خایاند، حەڤدە ڕۆژی تای لەگەڵدابوو.[٢٧٤] بەڵام ڕای تر هەیە دەڵێت حەڤدە ڕۆژی خایاندووە،[٢٧٥] ئیبن عەبدولهادیش پێی وایە زیاتر لە بیستوسێ ڕۆژ بووە.[٢٧٦]

[٢٧٠] – النویری: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠.
[٢٧١] – صفي الدين البخاري: س.پ، ل٤٠.
[٢٧٢] – الجزری: س.پ، ج٢، ل٢١٤
[٢٧٣] – الحسامی: س.پ، ل٤٣٤.
[٢٧٤] – هـ.س.
[٢٧٥] النویری: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠.
[٢٧٦] ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢٢٦.







ئەم هەواڵە گەشتە لای شەمسەدینی وەزیرلەدیمەشق، بۆیە داوای لە ئیبن تەیمیە كرد تا بچێتە بەندیخانەو ببینێت، ئەویش مۆڵەتی پێدا، وەزیر چوویە لای و پۆزشی بۆ دەهێنایەوەو داوای لێدەكرد لێی ببورێت، ئەویش وەڵامیدایەوە كە گەردنی هەموو نەیارەكانی ئازاد كردووە.[٢٧٧]

لەكاتی نەخۆشیەكەیدا وتی:"من گەردنی سوڵتان ناسر ئازادكردووە لەوەی كە بەندیكردوم، چونكە ئەو لەبەر ئارەزووی خۆی ئەمەی نەكردووە، بەڵكو وایانگەیاندوەتە لای... گەردنی هەموو كەسێكم ئازادكردووە كە شتێك لە نێوانماندا بێت تەنها دوژمنانی خواو پێغەمبەرەكەی نەبێت".[٢٧٨]

لە شەوی دووشەممە لە ٢٠ی ژیلقەعدەی ساڵی(٧٢٨ك/١٣٤٦ز) دا ئیبن تەیمیە لەدەمی بەری بەیانەوە لە قەڵای دیمەشق لەو هۆڵەی تیایدا بەندكرابوو كۆچی دواییكردو خەڵكێكی زۆر چوونە ناو قەڵاكەو مۆڵەتیان پێدرا بچنە لای و پیاوان و ئافرەتان بە كۆمەڵ دەچوونو تەرمەكەیان دەبینی و پیاوان ماچیان دەكردو ئافرەتانیش تەنها سەیریاندەكرد،[٢٧٩]

[٢٧٧] – الكرمي: س.پ، ل٣٨٤.
[٢٧٨] – هـ.س.
[٢٧٩] – النویری: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠؛ الجزری: س.پ، ج٢، ل٣٠٦–٣٠٧؛ ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢٢٦؛ الكرمي: س.پ، ل٣٨٤–٣٨٥.

پاشان تەرمەكەی شۆراو برایە دەرەوە، خەڵكی لە نێوان مزگەوت و قەڵادا ڕیزیان بەستبوو، كاتێك ڕۆژ بوویەوە تەرمەكە برایە مزگەوت وسەربازانیش لە دەوری تەرمەكەیدا بوون و لەتاو قەرەباڵغی و فشاری خەڵك تەرمەكەیان دەپاراست،[280] پاشان دەستكرا بە نوێژكردن لەسەری، یەكەمجار موحەممەدی كوڕی تەمام كە زانایەكی گەورەو ناودار بوو نوێژی لەسەر كرد، هێندە خەڵك هاتبوو تا نوێژی لەسەر بكات تا ئەوەی بازاڕی دیمەشق داخرا، تەنها بازاڕێك كە مابوو دووكانی مەسیحی و جوولەكەكان بوو چونكە جولەكەكان لە چەژنی (المقلە)یاندا بوون،[281] سەركردەو زاناو كەسایەتییەكان و سەربازوو پیاوو منداڵ هاتن بۆ ئەوێ،[282] لەناوكەسایەتیە دیارەكاندا سێ كەس نەهاتن، ئەوانیش ناسرابوون بە دژایەتی و ڕق و كینەیان بۆ ئیبن تەیمیە، كە بریتیبوون لە:"ئیبن جوملەو صەدرو قەفجاری"، بۆیە لەترسی ڕقی خەڵكی خۆیان شاردەوە، چونكە پێیان وابوو ئەگەر بچنە دەرەوە خەڵكی بەردبارانیان دەكەن و دەیانكوژن.[283]

پاش شۆردنی كفنی لێپێچرا، خەڵكی هەڵپەیان بوو تا ئەو ئاوەی ئیبن تەیمیەی پێ شۆراوە بیدەن لە خۆیان چونكە بە پیرۆز

---

[280] – النویری: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠؛ ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣٧.

[281] – الجزری: س.پ، ج٢، ل٣٠٧.

[282] – الكرمي: س.پ، ل٣٨٥.

[283] – البزار: س.پ، ل ٥٦٥؛ ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٤١؛ الحسامي: س.پ، ل ٤٥٢.





بڵاویاندەكرد، هەر چەندە ئیبن تەیمیە خۆی دژ بەو كارانە بوو و لە نووسینەكانیدا بە كارێكی ناشەرعی لە قەڵەمداوە.[284]

ئیبن كەثیری ڕاڤەكەری قورئان و مێژوونووسی بەناوبانگ و خوێندكاری ئیبن تەیمیە، چوویە سەر تەرمەكەی و پێش ئەوەی بیشۆن ماچیكرد،[285] پاشان چەند كەسێك ئەو خەتمەیان تەواوكرد كە ئیبن تەیمیە دەستیپێكردبوو و تەواوی نەكردبوو، ئەو خەتمی قورئانە بە خەتمی هەشتاویەكەمی كۆتا بەندبوونی دادەنرێت،[286] لەو خەتمەیدا گەشتبوویە سوورەتی (الرحمان).[287]

لەو كەسانەی تەرمەكەیان شت، زانا مـوززیو تاجەدین مەحموودی فارقی و شەمسەدینی كوڕی وەزیر بوون،[288] تەرمی ئەحمەدی كوڕی عەبدولحەلیم هێنرایە دەرەوەو هەموان بەرەوڕووی چوون و قەرەباڵغی ئەو شوێنەی گرتەوە، پاشان تەرمەكەی لە مزگەوتی ئومەوی دانراو مزگەوت پڕبوو لەخەڵك و زۆرێكیش لەدەرەوە مانەوە، لە دوای نوێژی نیوەڕۆ كۆمەڵ كۆمەڵ

---

[284] – الكرمي: س.پ، ل ٣٨٥.

[285] –ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٤٠.

[286] – النویری: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠؛ الجزري: س.پ، ج٢، ل٣٠٧؛ ابن كثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٤٠؛ الكرمي: س.پ، ل٣٨٤.

[287] – الجزری: س.پ، ج٢، ل٣٠٧.

[288] – النویری: س.پ، مج١٥،ج٣٣، ل٢١٠.

نوێژیان لەسەرکرد،[289] دواتر زەینەدینی برایشی نوێژی لەسەرکرد، ئینجا تەرمەکەی بەرەو گۆڕستان براو گریان و شینگێڕان خەڵکەکەی گرتەوە.[290]

مزگەوتەکە چوار دەرگای سەرەکی هەبوو: "الفرج" کە لەمەوە تەرمەکەیان بەرەو گۆڕستان برد، "باب الفراديس" و "باب النصر" و "باب الجابيه" ش خەڵکەکە لێوەی دەچوونە دەرەوە.[291]

ئیبن تەیمیە لەنێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسردا گەیەنرایە گۆڕستانی (الصوفيه) و لەپاڵ گۆڕی شەرەفەدینی برایدا گۆڕێکیان بۆ هەڵکەند، زەینەدین خۆی پێشتر سەیری ناو گۆڕەکەی کرد، پاشان تەرمەکەی خرایە ناو گۆڕەکەی و داپۆشرا.[292]

سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە زیاتر لە "پێنج سەد هەزار" کەس نوێژیان لەسەر کردووە،[293] یەکەم جار لە قەلاّکە نوێژی لەسەر کرا موحەممەدی کوڕی تەمامی حەنبەلی پێشنوێژی بۆ

[289]- الجزري: س.پ، ل ٣٠٧-٣٠٨؛ ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٤٠-١٤١؛ الكرمي: س.پ، ل٣٨٥-٣٨٦.

[290]- النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠؛ الجزري: س.پ، ج٢، ص٣٠٨؛ الكرمي: س.پ، ل ٣٨٦.

[291]- الجزري: س.پ، ج٢، ل٣٠٨؛ الحسامي: س.پ، ل ٤٣٨.

[292]- الجزري: س.پ، ج٢، ل٣٠٨.

[293]- الحسامي: س.پ، ل ٤٤٠.







خەڵکەکە کرد،[294] پاشان لە مزگەوتی ئومەوی نوێژی لەسەر کراو عەلائەدینی کوڕی خەرات بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد،[295] بۆ جاری سێهەم لە "سوق الخيل" نوێژی لەسەر کراو زەینەدینی برای بەر نوێژی کرد،[296] بۆ جاری چوارەم دوای بەخاکسپاردنی خەڵکی گوندو ناوچەکان دەهاتن نوێژیان لەسەر دەکر، بەڵکوو لەوپەڕی وڵاتانی ئیسلامیەوە لە ڕۆژی هەینیدا بانگەواز کرا تانوێژی ئامادەنەبوونی لەسەر بکەن،[297] لە بەخاکسپاردنی تەرمەکەشیدا زیاتر لە پانزە هەزار ئافرەت بەشدار بوون.[298]

کۆمەڵێکی زۆر لەسەرکردەو کەسەکان لەسەر گۆڕی ئیبن تەیمیە مانەوەو لەوێ خواردنیان بۆ ئامادەکرا و قورئانێکی زۆر لەسەر گۆڕەکەی خوێندرا.[299]

زەینەدینی برای تا چەند ڕۆژێک بەیانی تا ئێوارە دەچوویە سەرگۆڕەکەی و دواتر دەچوویەوە بۆ بەندیخانەکەی لە قەڵای دیمەشقتا جێگیری سوڵتان گەڕایەوەو ئازادی کرد.[300]

[294]- ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣٧.

[295]- الجزري: س.پ، ج٢، ل٣٠٨.

[296]= النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠.

[297]- الحسامي: س.پ، ل ٤٤٢.

[298]- ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣٨.

[299]- الجزري: س.پ، ج٢، ل٣٠٨.

[300]= النويري: س.پ، مج١٥، ج٣٣، ل٢١٠.

## تەوەرەی دووەم:
## (وتەی ناوداران لەسەر ئیبن تەیمیە)

لەدوای مردنی ئیبن تەیمیە چەندین کەسایەتی هەستیان بە گەورەیی ڕۆڵی ئەو کەسە کردووەو لەوبارەشەوە قسەیان لەسەر کردووە، لەوانە:

ئیبنوعەبدولهادی لە کتێبی (العقود الدرية) دا دەڵێت:" گەورە و مامۆستامان ئیبن تەیمیەی حەڕانی شەیخولئیسلام خاوەنی چەندین نووسینە کەنموونەی لەوجۆرە پێش ئەو نەبووە، لەناو زانایاندا گەورە بوو، هەرجۆرە زانستێکی وەرگرت و شمشێرێکی توند بوو لەڕووی لادەراندا، پێشەوایەکی حەقبێژو سەرخەری ئیسلام و دەریایەك بوو کە کەمی نەدەکرد"، کاریگەربوونیشی بە ئیبن تەیمیە وایلێکردووە کتێبێك لەسەر ژیانی بنووسێت و ناوی ناوە (العقود الدرية من مناقب شيخ الاسلام ابن تيمية).[301]

صەفیەدینی بوخاری وا سەیری دەکات کە:"ئیبن تەیمیە لە منداڵیەوە قورئانی لەبەرکردووەو تەفسیری وەرگرتووەو چەندین نووسینی هەیەو یەکێك لە زانا گەورەکانی سەردەمی خۆی بووە، لە زیرەکی و شارەزایی مەزهەبیدا نموونەی نەبوو"، لەوبارەشەوە

[301] – ل٦٠-٦١.





کتێبێکی لەسەر ژیانی نووسیوەو ناوی ناوە( القول الجلي في ترجمه الشيخ تقى الدين ابن تيميه الحنبلى).[302]

مەرعی کوڕی یوسفی حەنبەلی لەبارەیەوە دەڵێت:"ئیبن تەیمیە زانای پێشەوای خواناسی شەیخی ئیسلام و کۆتا موجتەهیدی ئیسلامەو چەندین نووسینی هەیەو نموونەی وەك ئەو نەبووە، هەر لەمنداڵیەوە سەرقاڵی زانست بووەو قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری لەبەر کردووە"، لەو بارەشەوە نووسینێکی هەیە بە ناوی (الكواكب الدرية في مناقب شيخ الاسلام ابن تيمية).[303]

ئیبن دەقیقیش لە سەر ئەم کەسایەتیە قسەی هەیەو دیدی خۆی وا نیشان دەدات:" کاتێك ئیبن تەیمیەم بینی پیاوێکم دی کە هەموو زانستەکان لەبەرچاوانی بوو، چی بویستایە وەریدەگرت و لای دەدا، منیش پێموت: بڕواناکەم خوا کەسی وەك تۆ دروست بکات".[304]

ئیبراهیمی ریقیش دەڵێت:" ئەگەر تەمەنی ئیبن تەیمیە زۆر بوایە دنیای پڕ زانست دەکرد، ئەو لەسەر حەقەو هەر دەبێت خەڵکی دژایەتی بکەن، چونکە میراتگری زانستی پێغەمبەرانە".[305]

[302] – ل٤.

[303] – ل٣٢٥-٣٣١.

[304] – بە وەرگرتن لە: ابن الوردي: س.پ، ج٢، ل٢٧٨.

[305] – بە وەرگرتن لە: الكرمي: س.پ، ل٣٢٣.

ئەبو حەییانی حەریریش سەرسامی خۆی لەڕووی ئیبن تەیمیەدا نیشان دەدات و ڕایدەگەیەنێت کە:"دووچاوی من کەسی وەك ئیبن تەیمیەیان نەدیوە".٣٠٦

ئیبنولوەردیش بەمجۆرە قسەی لەسەر دەکات:" چوومە کۆڕی ئیبن تەیمیەوە، دەبینم زانایانی سەردەمەکەی گەردوونێکن و ئەویش ناوچەقەکەیەتی یان جەستەیەك و ئەویش دڵەکەیەتی و بە هێندەی زیادەی تیشکی خۆر لەمانگ لێیان زیاترە".٣٠٧

عەلەمەدینی بەرزالی دەڵێت:"ئیبن تەیمیە پێشەوایەکە لەهەر بوارێکدا کەس بە تۆزی شوێنپێی ناگاتەوە، ئەو گەشتووەتە پلەی ئیجتهاد و مەرجەکانی ئیجتهادی تیادا کۆبووەتەوە".٣٠٨

عیمادەدینی واستی دەڵێت:"نموونەی خەلیفەکانی ڕاشیدین وپێشەوا ڕێنیشاندراوەکانە کە خەڵکی شوێنپێیان هەڵدەگرن، سوێند بەخوا، پاشان سوێند بەخوا، لە ژێر ئاسمانەوە نموونەی ئەو لە زانست و زیرەکی و شوێنکەوتەیی و ڕێزو نەرمونیانی و هەستان بە مافی خوا نەبینراوەو لە هەموویان زیاتر شوێنکەوتەی پێغەمبەرە".٣٠٩

---

[٣٠٦]– هـ.س.

[٣٠٧]– هـ.س.

[٣٠٨]– القطان: س.پ، ل١٦٢.

[٣٠٩]– الكرمي: س.پ، ل ٣٢٦.







ئیبن مەخلوفی نەیاری لەبارەیەوە دەڵێت:" کەسی وەك ئیبن تەیمیەمان نەدیوە، لە دژی هەوڵماندەداو نەمانتوانی لەناوی ببەین، بەلاّم ئەو دەسەلاّتی بەسەرماندا هەبوو لێبوردەبوو".٣١٠

شەوکانیش تێڕوانینی خۆی بەمجۆرە نیشان دەدات:" دوای ئیبن حەزم کەسی وەك ئەو بەدی ناکەم، وانازانم بێهەڵەوپەڵە بێت، بەڵکوو لەچەند شتێکدا ڕام لێی جیاوازە، زۆرێك هەن دان بەوەدا دەنێن دەریایەکی بێکەناری کەنزێکی بێوێنەیە، خەڵکی لەبارەیەوە دووبەشن، هەندێك تاوانباری دەکەن و هەندێکیش زیادەڕۆیی دەکەن، کەسێکی وەك ئیبن مەخلوف دادگاییکردووە کە بە قایشی نەعلی ئیبن تەیمیە دانانرێت".٣١١

خەیرەدینی ئالووسیش لەبارەیەوە دەڵێت:" دڵی خواناسان لەسەر خۆشویستنی یەك بووەو کەسانێکی زۆری ناموسڵمان لەسەر دەستی موسڵمان بون و ئیسلامی بووژاندوەتەوە"، لەو بارەشەوە کتێبێکی نووسیوە بەناوی (جلاو العینین في محاکمە الاحمدین ابن تیمیە – ابن الهیتمی). ٣١٢

---

[٣١٠]– العبادي: س.پ، ل ٣٨٨.

[٣١١]– الشوكاني: س.پ، ج١، ل٩٤–٩٥–٩٧.

[٣١٢]– ط١، المكتبة العصرية، (بيروت:٢٠٠٦م)، ل٢٥.

ئیبن کەپیری خوێندکاریشی قسەی خۆی دەکات:" لەهەر کۆڕێکدا بوایەو قسەی بکردایەو کەسێکی شارەزا لە بوارێکدا بیدواندایە، وایدەزانی ئەویش تایبەتمەندی ئەو بوارەیە، کاتێك مرد چوومە سەر تەرمی و پەردەی سەر ڕوویم لابردو سەیرمکردو ماچمکرد".٣١٣

ئیبن قەیمی جەوزی خوێندکاری ئیبن تەیمیە بووە هەوڵیداوە زیاتر مەنهەجی ئیبن تەیمە بنووسێتەوەو جیا لە هەموان وەك عارفێك نیشانی بدات، لە زۆربەی نووسینەکانیدا باسی دەکات،٣١٤ پوختەی بڕوای ئەو بەرامبەر بە ئیبن تەیمیە ئەوەیە:" خوای گەورە شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیەی بۆ ئایینەکەی خۆی هێنا تا سەریبخات".٣١٥

سیوطی دەڵێت:"ئیبن تەیمیە پێشەوای موجتەهیدی موفەسیرەو نموونەی وا لە سەردەمیدا کەمبووەو لە گەورە شارەزایانی زانستەکان بووەو سێسەد بەرگی نووسیوە".٣١٦

---

٣١٣– ابن کثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣٩–١٤٠.

٣١٤– الندوی: س.پ، ج٢، ل٥٣٦–٥٣٧.

٣١٥– الصواعق المرسلة، ط٣، دار العاصمة، (الریاض/١٩٩٨م)، ج٣، ص١٠٧٩.

٣١٦– طبقات الحفاظ، ل٥٢٠–٥٢١.







موحەممەد کوردعەلی دەڵێت:"ئەگەر بڵێین لە نووسینی وەڵامدانەوەی لادەرانی ئەهلی سوننەدا هیچ نوسینێك وەك ئەوانەی ئیبن تەیمیە نین، ئەوا هەموو ویژدانێکی ڕوولەقیبلە بڕوامان پێدەکات و بە ڕاستمان دەزانێت".٣١٧

موستەفا تەباتەبایی زانای شیعە بەمجۆرە لەسەر ئیبن تەیمیە لێدوانی داوە:" ئیبن تەیمیە هێمایەکی زانستە جیاجیا ئیسلامیەکانی وەك مێژوو و ئەدەب وریجال و فیقهو فەرموودەو مەزهەب و ئاییەنەکان و کەلام و ژیربێژی و تەفسیرو بوارەکانی ترە، ئەو ڕەخنانەی کە ستیوارت مل لەسەر مەنتیقی ئەرستۆ هێناویەتی، لە نووسینی ڕەخنەیی پێنج سەدە پێشتری ئیبن تەیمیە لە مەنتیقی ئەرستۆدا بەدەستدەکەون".٣١٨

موحەممەد ڕەشاد سالم کە لەژێر کاریگەری هزری ئیبن تەیمیەدایە دەڵێت:"ئیبن تەیمیە لەسەر بنەمایەکی کتێبی زانستی بەرفراوانی قورئان و سوننەت ڕۆشنبیری خۆی دامەزراندو توانی لایەنەکانی کەموکوڕتی و لادانی ڕۆشنبیری شالاوبەری دژ بە ئیسلام ئاشکرا بکات".٣١٩

---

٣١٧– بە وەرگرتن لە: القطان: س.پ، ل١٦٥.

٣١٨– بە وەرگرتن لە: الدوسری: س.پ، ل٢٤٩.

٣١٩– سالم: س.پ، ل١٣٨.

ئەبولحەسەنی نەدەویش پێی وایە:" ڕەوشێکی نالەباری وەك ئەو کات پێویستی بە چاکسازێکی وەك ئیبن تەیمیە هەبوو"، لەو بارەشیەوە نووسینێکی هەیە کە بەشی دووەمی کتێبی (رجال الفكر والدعوه في الاسلام) ی بە ئیبن تەیمیەو ڕۆڵی هزری خوێدکارەکانی ئیبن تەیمیە تایبەتکردووە.[٣٢٠]

موحەممەد ئەبووزەهرەش ڕای خۆی دەخاتەڕوو:" لێکۆڵینەوە لە ژیانی ئیبن تەیمیە وەك تیشکێکی ناو تاریکاییە، ئەو پێنووس و شمشێری پێکەوە هەڵگرت و شارەزای بوارە جیاجیاکانی شەریعەت بووە".[٣٢١]

[٣٢٠]- الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٣٤.

[٣٢١]- ابن تيمية، ل٥-٦.







# باسی پێنجەم

# (بەرهەمەکانی ئیبن تەیمیە)

بەرهەمەکانی ئیبن تەیمیە زۆرن، بەڵام ئەوەی گرفتی بەردەم زانینی هەموو بەرهەمەکانیەتی، بریتیە لەوەی کە هەندێك لە نووسینەکانی نەماون،[٣٢٢] بۆیە بەرهەمەکانی لەوانە زۆر زیاترن کە ئێمە لێرەدا هەندێکیان دەخەینە بەرچاو:

١. مجموعة الفتاوى: ئەمە یەکێکە لە دیارترین و بڵاوترین نووسینەکانی کە تا ئەمڕۆش لە جیهاندا خوێنەرێکی زۆری هەیە، نووسینەکە لە شێوەی پرسیار و وەڵامدایە، پرسیار لە ئیبن تەیمیە کراوەو ئەویش وەڵامی داوەتەوە، پرسیارەکانیش بوارە جیاجیاکانی بیروباوەڕو فیقهو تەفسیر و ئوصول و مەزهەب و ڕێڕەوەکان و...هتد لەخۆ دەگرێت.[٣٢٣]

٢. الفتاوى الكبرى: ئەمانەش کۆمەڵێك فەتوای تری ئیبن تەیمیەن ولەچەند بەرگێکدان کە هەندێکجار بە (الدرر المضية في فتاوى ابن تيمية).[٣٢٤]

[٣٢٢]- سالم: س.پ، ل٢٣.

[٣٢٣]- بڕوانة: ابن تيمية: مجموع الفتاوى.

[٣٢٤]- ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٧٨.

٣. درء تعارض العقل والنقل: ئەم كتێبە ئێستا یانزە بەرگی ماوە، لە بنەڕەتدا سیٚ ئەوەندە بووە، واتە زیاتر لە سی بەرگ، بەڵام دوو بەشی فەوتاوە،[٣٢٥] تیایدا ئیبن تەیمیە قسە لەسەر عەقڵ و نەقڵ و پێكەوەگونجانیان و حوكمی هەركامیان دەكات.[٣٢٦]

٤. مناهج السنة النبوية: لەم كتێبەیدا هەوڵدەدات بەشێوەیەكی گشتی قسە لەسەر شیعەو دەستەو تاقمەكانیو بیروباوەڕیان بكات، پاشان لە دیدێكی ڕەخنەییەوە قسەی لەسەر دەكات، ئەم نووسینەی چوار بەرگە.[٣٢٧]

٥. الصارم المسلول فی الرد علی شاتم الرسول: هۆكاری نووسینی ئەم كتێبە ئەوە بوو كەسێك بە ناوی عوسافی نەصرانی شایەتی لەسەر درابوو كە قسەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وتووە، ئیبن تەیمیەش لەگەڵ زەینەدینی فارقی لە دژی وەستان و دواجار عوساف موسڵمان بوو، ئیبن تەیمیە ئەم كتێبەی نووسی و تیایدا حوكمی ڕاشكاوانەی قسەوتن بە پێغەمبەر(ﷺ)ی هێناوە.[٣٢٨]

٦. الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح: ئەم كتێبەی بە دوو ئامانج نووسی:

---

[٣٢٥] – سالم: س.پ، ل٢٣.
[٣٢٦] – بڕوانە: ابن تیمیة: درء تعارض العقل والنقل.
[٣٢٧] – بڕوانە: ابن تیمیة: منهاج السنة النبوية.
[٣٢٨] – الندوی: س.پ، ج٢، ل٤٥٧.







یەكەم: حەزی خۆی بۆ ڕوونكردنەوەی مەسیحیەت بۆ موسڵمانان.

دووەم: نووسینێك لە قوبرسەوە دەربارەی ڕاستی مەسیحیەت هات، ئیبن تەیمیە بەرامبەر بەمە هەڵسوكەوتێكی بەرگریكاری گرتەبەر و ئەم كتێبەی لە دژ نووسیو بە چاوێكی ڕەخنەگرانە قسەی لەسەر مەسیحیەتی ئەوكات و پێشتریش كردووە.[٣٢٩]

٧. الرد علی المنطقیین: ئەم كتێبەی لە ئەسكەندەریە نووسیو ماوەی نووسینەكەشی لە نێوان نیوەڕۆ و عەسری ڕۆژێكدا بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی كەسانێكی بینیوە بە گەورە ناوی فەیلەسوفەكانیان بردووە، بەم نووسینەی هەوڵیدا وەڵامیان بداتەوە.

٨. العقیدة الواسطیة: ئەم كتێبەش قسە لەسەر بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە دەكاتو یەكێكە لەو نوسینانەی كە زۆرێك لە موسڵمانانی ئەهلی سوننە پشتی پێدەبەستنو تا ئەمڕۆش لە نێوانیاندا بڵاوە و چەندین شرۆڤەكاری بۆ كراوە، دیارترینی ئەو شرۆڤەكاریانەش بەهەوڵی شێخ (محمد بن صالح العثیمین)كراوە.[٣٣٠]

---

[٣٢٩] – أبوزهرة: س.پ، ل٤١٠–٤١١.
[٣٣٠] – بڕوانە: ابن عثیمین: شرح العقیدة الواسطیة، ط١، دار ابن الهیثم، (القاهرة/٢٠٠٢م)، ل٣٠–٤٠، ٦٥، ١١١، ١٦٧.

٩. الأيمـــان: تيايـدا جيـاوازی لـە نێـوان ئیمـان و ئیـسلام و زیـادبوون و کـەمکردنی ئیمـانی کـردووە، قـسەشی هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئایـا کـارکردن دەچێتە چوارچێوەی ئیمانـەوە یـان نـا، لەمەشـدا بەڵگـەی قورئـان و فـەرموودەو ڕای زانایـانی هێنـاوەو کۆتاجار ڕای خۆی نیشانداوە.[٣٣١]

١٠. تنبيه الرجل العاقل على تمويه الجدل الباطـل: ئەم نووسینەش دەچێتە چوارچێوەی بابەتە بیروباوەڕیەکانەوەو تیایدا ڕەخنـەی لە چـەند دەسـتەو تاقمێـك گرتـووەو هەوڵـە سـاختەکاریەکانیان بـە فێڵزانـی ڕێـوی دەچـوێنێت، ڕەخنەیـەکی تونـد لـەوە دەگرێـت کـە مەنتیق هێنراوەتە ناو زانستە ئیسلامیەکانەوە.[٣٣٢]

١١. الكيلانية.

١٢. البعلبكية.

١٣. البغدادية.

١٤. القادرية.

١٥. الأزهرية.

١٦. المصرية.

١٧. الصفدية.

[٣٣١] – أبوزهرة: س.پ، ل٤٠٨.

[٣٣٢] – هـ.س.





١٨. الهلاونية .

١٩. اقتضاء الصراط المستقيم.

٢٠. السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية.

٢١. رفع الملام عن الائمة الاعلام.

٢٢. تفضيل صالح الناس على سائر الاجناس.

٢٣. الشفاعة .

٢٤. المسائل الاسكندرية في الرد على الملاحدة الاتحادية.[٣٣٣]

٢٥. الاستغاثةو التوسل.

٢٦. تقرير مسائل التوحيد.

٢٧. أعتقاد الفرقة الناجية.

٢٨. الكلم الطيب.

٢٩. رفع الملام عن الائمة الاعلام.[٣٣٤]

٣٠. فضائل القران.

٣١. أقسام القران.

٣٢. أمثال القران.

٣٣. محنتي في مصر.

٣٤. الرد على الفلاسفة.

[٣٣٣] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٧٧-٩١.

[٣٣٤] – البزار: س.پ، ل٥٨٧-٥٨٨.

٣٥. التحفة العراقية في الأعمال القلبية.
٣٦. بيان الدليل على بطلان التحليل.
٣٧. شرح أول كتاب الغزنوي في أصول الدين.
٣٨. الرد على البكرى.
٣٩. الرد علي كسروان الرافظة.
٤٠. أبطال الكيمياء.
٤١. الفتاوى المصرية.
٤٢. الرد على ابن عربي.
٤٣. الكلام على دعوة ذى النون.
٤٤. الكلام على ارادة الرب وقدرته.
٤٥. مسألة في العلو.
٤٦. الوسيلة.
٤٧. العقيدة المراكشية.
٤٨. الشهادة بالأستفاضة.[٣٣٥]
٤٩. *تلخيص التلبيس من تأسيس التقديس*.
٥٠. تلبيس الجمهية في تأسيس بدعهم الكلامية.
٥١. منهاج الأستقامة والأعتدال.
٥٢. نكاح المحلل و أبطال الحيل.[٣٣٦]

---

[٣٣٥] – ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٧٧-٩١.







٥٣. الدر الملتقط.
٥٤. الفرقان المبين بين الطلاق واليمين.
٥٥. أحكام الطلاق.
٥٦. المسائل الجزرية.
٥٧. المسائل المفردة.
٥٨. تفسير سورة الاخلاص.
٥٩. أثبات الكمال.[٣٣٧]
٦٠. تفصيل الأجمال فيما تجب لله من صفات الكمال.
٦١. العقيدة الحموية.
٦٢. العقيدة التدمرية.
٦٣. عقيدة أهل السنة والجماعة.
٦٤. الواسطة بين الحق والخلق.
٦٥. معالم الوصول في تفنيد قول الفلاسفة والقراطسة في كذب الانبياء في بعض الاحيان.
٦٦. رسالة القضاء والقدر.
٦٧. الوصية الصغرى في الدين والدنيا.
٦٨. معتقدات أهل الضلال.

---

=

[٣٣٦] – الكرمي: س.پ، ل٣٣٦.

[٣٣٧] – البزار: س.پ، ل٥٨٧-٥٨٨.

٦٩. تخجيل اهل الانجيل.

٧٠. المسئلة النصيرية.[٣٣٨]

٧١. محبة الله للعبد.

٧٢. التحفة العراقية.

٧٣. العلم المحكم.[٣٣٩]

٧٤. التوسل الوسيلة.

٧٥. الوصية الكبرى في بيان الغرقة الناجية.

٧٦. مسئلة الكنائس.

٧٧. نقض المنطق.

٧٨. الرد على الحلوية و الاتحادية.

٧٩. ابطال قول الفلاسفة باثبات الجواهر العقلية.

٨٠. نقد تأسيس الجهمية.

٨١. بغية المرتاد في الرد على الفلاسفة والقرامطة والباطنية.

٨٢. شرح حديث النزول.

٨٣. معارج الوصول.

---

[٣٣٨]- سعيد عبدالعظيم: منهج شيخ الإسلام ابن تيمية التجديدي السلفي و دعوته الإصلاحية، ط١، دار العقيدة، (القاهرة:١٩٩٩م)، ص١٩٢-١٩٥.

[٣٣٩]- ابن القيم: مؤلفات ابن تيمية، ط١، دار الكتاب العربي، (بيروت/١٩٨٥)، ص٢١-٢٢.





٨٤. رسالة الاكيل في المتشابه والتأويل.

٨٥. بيان الهدي من الظلال.

٨٦. جوامع السياسة الألهية.[٣٤٠]

٨٧. تحريم السماع.قيم٢٢

٨٨. التحرير في مسألة الخضر.

٨٩. امراض القلوب و شفائها.

٩٠. ابطال قول الفلاسفة بقدم العالم.

٩١. الصعيدية.

٩٢. شرح مسائل من الاربعين للرازي.

٩٣. الاربلية.

٩٤. توحيد الفلاسفة على نظم ابن سينا.

٩٥. الحوفية.

٩٦. شرح العمدة.

٩٧. شرح المحرر.[٣٤١]

---

[٣٤٠]- عبدالعظيم: س.پ، ل١٩٢-١٩٥.

[٣٤١]- ابن القيم: س.پ، ل ٢١-٢٦.

## نامەکانی:

١. نامەی( المدنیە).
٢. نامەی میسری.
٣. بۆ خەڵکی بەغداد.
٤. بۆ خەڵکی عێراق.
٥. بۆ خەڵکی بەسرە.[342]
٦. بۆ دیمەشق.
٧. بۆ دایکی.
٨. بۆ پاشای میسر (سوڵتان ناسری مەملووکی).[343]
٩. بۆ پاشای قوبرس.
١٠. بۆ بەحرەین و پاشاکانی عەرەب.
١١. بۆ پاشای حەما.
١٢. بۆ ماڵی شێخ جاکیر.
١٣. بۆ شێخ عدی کوڕی موسافیر.
١٤. بۆ دادوەر سروجی حەنەفی.[344]

بەرهەمەکانی ئیبن تەیمیە لەمانە زیاترن و ئەگەر بە وردەکاریەوە بە ناو سەرچاوەکاندا بگەڕێین چەندین نووسینی تری بەردەست دەکەون.

[342]– هـ.س.
[343]– ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٤١، ١٧٠، ١٦٨.
[344]– ابن قیم: س.پ، ل٣٠.







## ( تایبەتمەندی نووسینەکانی ئیبن تەیمیە)

نووسینەکانی ئیبن تەیمیە کۆمەڵێك سیفەت و تایبەتمەندییان تێدایە کە پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکەین، لەوانە:

١– ڕوونبێژی: ئیبن تەیمیە لە نووسینەکانیدا هەوڵنادات کوت و پێچ و پەناو ئاڵۆزی بەکاربهێنێت، بەڵکوو بە شێوازێکی ڕوون بابەتەکە دەخاتە بەرچاو تا زۆرینە لێی تێبگەن.[345]

٢– ڕاشکاوی: ئەو کەسەی نووسینەکانی بخوێنێتەوە، دەبینێت ڕاشکاوانە ڕای خۆی دەڵێت و هەوڵنادات خۆی لە بابەت دەرباز بکات، لەسەر ئەمەش چەندجار ئازاری چەشتووە.[346]

٣– پێش هەموو شتێك بەڵگەی قورئان دەهێنێتەوە، پاشان تا دەتوانێت فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) وڕای هاوەڵان و زانایان دێنێت و ڕاجیاوازەکانیش دەخاتە بەردەست.[347]

٤– دوورەپەرێزی لە دەمارگیری مەزهەبی: ئەو پێی وایە هەر ڕایەکی مەزهەبێك لەگەڵ قورئان وسوننەت و ئیجماعدا

[345]– أبوزهرة: س.پ، ل ٤١٦.
[346]– الندوی: س.پ، ج٢، ل٥٣٧.
[347]– الكرمي: س.پ، ل٣٤٩–٣٥٠.

بگونجێت دروستە، هەروەها هەوڵیداوە نەکەوێتە پاڵ مەزهەبێك و ڕاشکاوانەش ئەوەی دەربڕیوە.[٣٤٨]

٥- تێڕامانی هزری‌و وردبوونەوەی زۆر قووڵ لە بابەتدا: بۆیە توانی بەرامبەر بە ڕەوتە ئایینی و هزری و سیاسی و کۆمەڵایەتیە جیاجیاکان بوەستێت.[٣٤٩]

٦- دووروودرێژی: یەکێك لەسیفەتەکانی نووسینەکانی بریتیە لەوەی بۆ بابەتێك دووروودرێژیەکی وا بەکاردێنێت کە خوێنەر تووشی بێزاربوون دەکات.[٣٥٠]

٧- دووبارەکردنەوە: هەندێکجار لەیەك نووسیندا بابەتێك چەندبارە دەکاتەوە.[٣٥١]

٨- خەسڵەتی ئەدەبی لە نووسینەکانیدا بەدیدەکرێت.[٣٥٢]

٩- جۆراوجۆری بابەتەکان: ئیبن تەیمیە تەنها لە بوارێکی دیاریکراودا نەینووسیوە، بەڵکوو لە پاڵ تەفسیرو شەرحی فەرموودەدا لە فیقه و ئوصول و بیروباوەڕو فەلسەفەو کەلام‌و مەنتیق‌و سیاسەت و...هتد.دا نووسینی هەیە.[٣٥٣]

---

[٣٤٨]- الحسامی: س.پ، ل٣٠٥.

[٣٤٩]- أبوزهرة: س.پ، ل ٤١٦.

[٣٥٠]- الندوی: س.پ، ج٢، ل٥٤٥.

[٣٥١]- ابوزهرة: س.پ، ل ٤١٧.

[٣٥٢]- الندوی: س.پ، ل ٥٤٥.

[٣٥٣]- هس، ل٥٤٤.







# بەشی سێیەم

# ڕۆڵ و کاریگەری ئیبن تەیمیە لە مێژووی ئیسلامیدا

# باسی یەکەم
## (ڕۆڵی جیهادی ئیبن تەیمیە)

ئیبن تەیمیە خەسڵەتێکی دیاری کوردانی تێدابوو کە بریتیبوو لە بەهێزیو دلێریو توانای جەنگی،[354] لەمەشدا بەزار وەسفی دەکات کە لە دلێریو جیهادی دژ بە دوژمنانی ئیسلامدا نموونەی نەبووەو بە دڵوزمان و دەستی جیهادی دوژمنانی دەکرد.[355]

ئەوەی ئیبن تەیمیە لە غەزالی یان چەند زانایەکی تر جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە لەگەڵ پێنووسەکەیدا شمشێریشی بەکاردەهێنا، هەوڵی زانستخوازی نەدەبوویە ڕێگری ئەوەی جیهادی نەیارانی ئیسلام و شالاوبەرانی وەك مەغۆل پشتگوێ بخات.[356]

ئەو لە سەرەتای گەنجیەوە بەشداری جیهادی موسڵمانانی دەکردو ئەگەر ترس و دڵەڕاوکێی لێ بەدیبکردنایە، هانیدەدان و مژدەی سەرکەوتنی بۆ دەخستنەڕوو و گەورەیی جیهاد و موجاهیدانی دەخستەبەرچاو، سواری ئەسپەکەی دەبوو و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد(الله اکبر) و مەرگی پشتگوێ دەخست و بەرەو ڕووی دوژمنان دەچوو.[357]

---

[354]– ابوزهرة: س.پ، ل١٨.
[355]– البزار: س.پ، ل٦١٠.
[356]– سالم: س.پ، ل٢٤–٢٥.
[357]– البزار: س.پ، ل٦١٠.







لە فەتحی عەککادا توانایەکی بەرچاوی نیشانداوەو هەندێك پێیان وایە یەکێك بووە لەوانەی بەهۆی ڕاوێژپێکردنی و تێڕامانی وردیەوە بووەتە هۆکاری سەرکەوتنیان.[358]

ئیبن تەیمیە هەواڵی هاتنی غازان خانی سەرکردەی مەغۆلەکانی بۆ دیمەشق بیست، بە هاتنی ئەو هەواڵە زۆرێك لەسەرکردەو زاناکان وڵاتیان بەجێهێشت و ترس ناوچەکەی گرتەوە، ئیبن تەیمیەش خەڵکی هاندا تا بەرگری بکەن و شەهیدی لەلا بەچێژکردن و بەڵێنی سەرکەوتن و نەمانی ترسی پێدان.[359]

بەمە هەندێك لە ناودارانی شارەکە لەگەڵ ئیبن تەیمیە کۆبوونەوەو چوون بۆ لای غازان خان، غازان کە ئەوانەی بینی وتی: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەمانە گەورەو دیارەکانی دیمەشقن، ئەویش مۆڵەتی پێدان تا بچنە لای، ئیبن تەیمیە پێش هەموویان کەوت و ئەوەی بە ڕاستی دەزانی وتی و هەڕەشەی ئەگەری ڕژانی خوێنی موسڵمانانی لێکردو لە وتەکانیدا وتەی خواو پێغەمبەری(ﷺ) دەهێنایەوەو دەنگی لە ڕووی غازاندا بەرز دەکردەوەو بەرەو ڕووی دەچوو تا ئەوەی ئەژنۆی لە ئەژنۆی غازان نزیکبوویەوە، سوڵتانیش گوێی لێدەگرت و سەرسامبوو و پرسی

---

[358]– الحسامي: س.پ، ل١٦٢.
[359]– البزار: س.پ، ل٦١٠.

ئەم کەسە کێیە؟ من کەسی وام نەدیوە! ئەوکات باسی زانست و ڕۆڵی ئیبن تەیمییەی بۆ کرا، غازان وتی: ئەگەر پێت خۆشە ولاّتی باوباپیرانت بۆ بنیاد دەنێمەوەو لەوێ ببە بە بەرپرسی، بەڵام ئیبن تەیمیە ڕازینەبوو، بەرامبەر بەوە بوو بە هۆکاری ئازادبوونی ژمارەیەك لە دیلەکان.[٣٦٠]

ئیبن تەیمیە کەزانی هەڵمەتی مەغۆلی ناوەستێت و موسڵمانانیش جارێك لەبەردەمیاندا شکابوون، خۆی چوو بۆ میسر و لەوێ سوڵتانی هاندا تا بەسەربازەکانیەوە بێتە شام و دژ بە مەغۆلەکان بجەنگێت.٣٦١

لەماوەی شکستی یەکەمی موسڵمانانادا شام کەوتە بەر ڕەوشێکی ترس و زاڵبوونی دزو جەردەو دڵەڕاوکێ و خەڵکی بلاّوەیان لێکرد،[٣٦٢] سوڵتانی مەغۆلیش بەرەو دیمەشق دەهات، ئیبن تەیمیە و کۆمەڵێك ناودار چوونە لای و ئیبن تەیمیە لە ڕێگەی وەرگێڕێکەوە لەگەڵ غازاندا قسەی دەکردو پێی وت: پێی بڵێ تۆ بانگەشە دەکەیت موسڵمانیت و بانگبێژو دادوەرو پێشەواو مامۆستات لەگەڵە، ئیتر بۆچی هێرش دەکەیتە سەر ولاّتی ئێمە؟ باوکو باپیریشت بێباوەڕبوون و هێرشیان نەبردینە سەرو بەڵێنیان پێیداین، کەچی تۆ ناپاکیت لە بەڵێنەکە کرد.[٣٦٣]

---

[٣٦٠]- هـ.س: ل٦١١.

[٣٦١]- الحسامي: س.پ، ل١٩٢-١٩٣.

[٣٦٢]- ابوزهرة: س.پ، ل ٣٣.

[٣٦٣]- الحسامي: س.پ، ل١٧٤-١٧٥.







دواتر خواردن هێنراو هەموان نانیان خوارد جگە لە ئیبن تەیمیە، پرسیاریان لێکرد بۆچی نان ناخوات، ئەویش پێی وتن چۆن نانێك دەخوات کە لە خەڵك سەنراوە؟ غازان داوای لە ئیبن تەیمیە کرد تا نزای بۆبکات، ئەویش ئەم نزایەی بۆکرد:" خوایە ئەم بەندەی تۆ ئەگەر لەبەر سەرخستنی پەیامی تۆو بۆ ئەوە جەنگ دەکات کە هەموو ئایین بۆ تۆ بێت سەری بخەو پاڵپشتی دەسەلاّتی بکەو خاك و وولاّتی بدەرە دەست، ئەگەریش لەبەر ڕووپاماوی و دنیا ویستی یەو بۆ سەرخستنی خۆی و شکستی ئیسلام و موسڵمانانە، خوایە سەرشۆڕی بکەو تێکی بشکێنە"، غازانیش دەستی بەرز کردبوویەوەو ئامینی بۆ نزاکەی دەکرد.[٣٦٤]

بالسی کە لەگەڵ ئیبن تەیمیە چووبوو بۆ ئەو دانیشتنە، دەڵێت هەموومان دەترساین و چاوەڕێ بووین ئیبن تەیمیە بکوژێت، کاتێك چوونە دەرەوە دادوەری دادوەران سەسرەی بە ئیبن تەیمیە وت: "خەریکبوو هەمووومان بەکوشتن بدەیت، ئێمە لەمەودوا لەگەڵ تۆ نین" ئەویش وتی: "بەڵکوو سوێند بەخوا من هاودەمیتان ناکەم". لە ڕێدا ئیبن تەیمیە بەسەلامەتی گەشتەوە جێی خۆی و سێسەد سواریش بوونە هاودەم و هەواداری‌و لەگەڵی چوون بۆ دیمەشق، ئەوانی تریش کەوتنەبەر هەڵمەتێکی تەتەرەکان.[٣٦٥]

---

[٣٦٤]- الکرمي: س.پ، ل٣٤٤-٣٤٥.

[٣٦٥]- ابن کثیر: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٩٢.

تەتەرەكان هەوڵیاندا بە وتوێژ دیمەشق لە موسڵمانان بسەنن، كاتێك قبجق داوای بەدەستەوەدانی قەڵای دیمەشقی كرد، ئیبن تەیمیە هەواڵی بۆ بەرپرسەكەی نارد كە ئەگەر یەك بەردیشی تێدا مابێت ئەگەر توانیت قەڵاكەیان نەدەیت بەدەستەوە، ئەو كارە بەرژەوەندیەكی گەورەی بۆ خەڵكی شام تێدایە.[366]

لە ڕۆژی هەینی چواردەی ڕەبیعولئاخری (٦٩٩ك/١٢٩٩ز لە مینبەرەكانی دیمەشق و بە ئامادەبوونی مەغۆل لە دیمەشق وتار بۆ غازان خوێندرایەوە، دواتر كەوتنە تالآن و بڕی و سوتاندن و كوشت وبر.[367]

ئیبن تەیمیە دووبارە لەگەڵ چەند هاودەمێكیدا چوو بۆ لای غازان، بەلآم ڕێی پێنەدرا غازان ببینێت,[368]پاشان مەغۆل كەوتە لێدانی قەڵای دیمەشق و لە شاردا زیناو مەیخواردن بلآوبوویەوە.[369]

كۆمەڵێك لەسەربازانی قەڵاكە هاتنەدەرێ و كوشتارێكی مەغۆلەكانیان كردوو لەو نێوەندەش دا ژمارەیەك لە موسڵمانەكان كوژران، قبجق هەوڵیدا بە ئاشتی قەڵاكە بگرن و كۆمەڵێك لە

[366] – هـ.س: ج١٤، ل٩.

[367] – طقوش: تأريخ المماليك، ل٢٤٣.

[368] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٩.

[369] – الحسامي: س.پ، ل١٨٥.







موسڵمانانی نارد بۆلای جێگیرەكەی، بەلآم ئەو بەدەستیەوە نەدا.[370]

لە(٨ی ڕەجەب) دا ئیبن تەیمیە جارێكی تر هاتەوە بۆلای غازان وداوای ئازادكردنی ژمارەیەك لە موسڵمانانی كرد، پاشان لەبەرەبەیانی هەینیدا ئیبن تەیمیە كەوتە لەناوبردنی مەیخانەكان، پاشان دەرگای (الخرج)ی داخراویشی كردەوە.[371]

لە هەینی بیستی شەوالی ساڵی(٦٩٩ك/١٢٩٩ز) دا جەمالەدین ئاقوش ئەفرەم بە سوپاكەیەوە چوو بۆ شاخی جەردو كیسراوان، چونكە بیروباوەڕو كرداریان خراپ بوو، ئیبن تەیمیەش بە ژمارەیەك خۆبەخشەوە بەشداری كرد، بەڵام سەركردەكانیان هاتن بۆلای ئیبن تەیمیە و تەوبەیان كرد، ئەویش ماڵوسامانێكی لەسەریان دانا،[372] دوابەدوای ئەوە كەوتنە خۆئامادەكردن بۆ جەنگی تەتەرەكان ئیبن تەیمیەش خەڵكی هاندەدا كە لەو پێناوەدا پارەو توانای خۆیان بخەنەگەڕ.[373]

لەو ماوەیەدا هەواڵ هات كە سوڵتان گەڕاوەتەوە بۆ میسر، بەمە خەڵكەكە هیوابڕاو بوون و ترس شامی گرتەوە، بەلآم ئیبن

[370] – هـ.س.

[371] – النويري: س.پ، مج١٤، ج٣١، ل٢٤٦.

[372] – ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل١٣–١٤.

[373] – الحسامي: س.پ، ل١٩.

تەیمیە چوو بۆلای جێگری شام و سەربازان و هانیدان تا لە ڕووی تەتەردا بوەستن و دەستبەردار نەبن، پاشان گەڕایەوە بۆ شام و بڕیاریدا بچێت بۆ میسر تا سوڵتان هانبدات بێت بۆ شام و دژ بەمەغۆلەکان بجەنگێت.[374]

ئیبن تەیمیە چوویە لای مەمالیکەکانی میسر و بەسوڵتانی وت:"ئەگەر قەدەری خوا وابوایە شامیش لەدەست ئێوەدا نەبوایە و ئێوە پاشا نەبوونایەو ئەوان داوای یارمەتییان لێبکردنایە، ئەرکی سەرشانتان بوو تا سەریانبخەن، چ جای ئەوەی ئێوە فەرمانڕەواو سوڵتانیانن و ئەوانیش هاوڵاتیانی بەردەستتانن و ئێوە لێیان بەرپرسن"[375]،بەمە هەموویانی هانداو بڕیاریاندا بەرەو شام بەڕێکەون، کە سەربازانیش گەشتنە شام خەڵکی دڵخۆشبوون،[376] ئیبن تەیمیەش گەڕایەوە بۆ شام و سوپای موسڵمانان و تەتەرەکان لە یەکتر نزیکبوونەوەو ئیبن تەیمیە سوێندی بۆ سەرکردەکان خوارد کە ئەمجار سەردەکەون، پاشان وتی:" ئەگەر منتان لە ڕیزی مەغۆلەکانیشا بینی قورئانێکم لەسەر سەر بوو بمکوژن".[377]

[374]– القطان: س.پ، ل٤٧.

[375]– الحسامي: س.پ، ل١٩٣.

[376]– محمد يوسف: س.پ، ل٨٤.

[377]– الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٧٣.





مانگی ڕەمەزان هات و سوپای موسڵمانان لە ئامادەباشیدا بوون، ڕۆژی شەممە ئەگەری جەنگ بوو، بارانێکی بەلێزمە باری و سوپای شام ومیسر لە (مرج صفر) کۆبوونەوەو خودی سوڵتان ئامادەبوو، سوڵتان لە ناوەڕاستی سوپاو سەلارو بینبس وئەیبەك و بەکتمر لە چواردەوریدا بوون.[378]

ئیبن تەیمییە فەتوای دەرکرد تا موسڵمانان ڕۆژوەکانیان بشکێنن و خۆشی لەوەدا دەستپێشخەر بوو،[379] لەعەسری ڕۆژی شەممەدا جەنگێکی سەخت ڕوویدا و تادوای نیوەڕۆی یەکشەممە بەردەوام بوو و تیایدا مەمالیکەکان سەرکەوتن و ژمارەیەکی زۆر لە مەغۆلەکان کوژران، ئەو جەنگە بە جەنگی شەقحەب ناسراوە.[380]

سوڵتان لەو جەنگەدا تووشی دوودڵی بوو، ئیبن تەیمیە پێی وت: خۆڕاگربە، چونکە دڵنیابە سەردەکەویت،[381] پاش سەرکەوتن سوڵتان گەڕایەوە بۆ دیمەشق[382] و ئیبن تەیمیەش گەڕایەوە و زۆرێك لەسەرکردە و کەسەکان وەسفیاندەکرد، ئەویش پێی وتن:من پیاوی گەلم نەوەك دەوڵەت.[383]

[378]– طقوش : تأريخ المماليك، ل٢٤٩.

[379]– القرني: س.پ، ل٤١.

[380]– طقووش: تأريخ المماليك، ل٢٥٠.

[381]– ابن كثير: س.پ، مج٧، ج١٤، ل٢٧.

[382]– طقوش: تأريخ المماليك، ل٢٥١.

[383]– الحسامي: س.پ، ل٢٠٥.

پاشان ئیبن تەیمیە چوو بۆ شاخی کیسرەوان کە شاخێکی زۆر سەخت بوو، ڕافیزەکان دەستیانبەسەردا گرتبوو، دانیشتوەکانی ئەوکاتی سەرکەشبوون، پاش هەوڵێکی بەهێز شاخەکە گیرا،[٣٨٤] دوای ئەوە ئیبن تەیمیە نامەیەکی بۆ سوڵتان ناسر نارد و هەواڵی ئەو سەرکەوتنەی پێدا.[٣٨٥]

٣٨٤- ابن عبدالوهاب: س.پ، ل١٣٩-١٤٠.

٣٨٥ - الحسامي: س.پ، ل٢١٠.





## باسی دووەم

## (ڕۆڵی چاکسازی ئیبن تەیمیە)

ئیبن تەیمیە لەسەردەمی خۆیدا گۆڕانێکی گەورەی کردو بانگەوازی بۆ نوێگەری بیروباوەڕو پەرستش و بوارەکانی تر دەکرد، نوێگەرییەك کە لە مێژووی ئیسلامدا وێنەی کەمە یان نیە.[٣٨٦]

بنەڕەتی هەنگاوی چاکسازی و نوێگەری لای ئیبن تەیمیە لە چوار خاڵی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە:

یەکەم: نوێگەری بیروباوەڕی یەکتاپەرستی و لێدانی بیروباوەڕە شیرکیەکان.

دووەم: ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەو مەنتیق و زانستی کەلام و سەپاندنی قورئان و سوننەت بەسەر هەموو شتەکاندا.

سێیەم: بەرپەرچدانەوەی دەستەو تاقمە نائیسلامیەکان و بەرەوڕووبوونەوەی بیروباوەڕیان.

چوارەم: نوێگەری زانستە شەرعیەکان و زیندووکردنەوەی هزری ئیسلامی،[٣٨٧] بۆ ئەمەش چەند بنەمایەکی هەبوو، لەوانە: پێشخستنی قورئان و سوننەت بەسەر عەقڵدا، بەرپەرچدانەوەی

٣٨٦- القرني: س.پ، ل٩٥.

٣٨٧- الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٧٩

هەر لێکدانەوەیەکی کەلامی، شوێن نەکەوتنی کەسەکان بە ناوهێنانیان، بەڵکوو بەپێی وتەکانیان بڕیاری لە بارەی کەسەکان و بابەتەکانەوە دەدا، نەبوونی دەمارگیری مەزهەبی و چەقبەستوویی و...هتد.[388]

- نوێگەری بیروباوەڕی یەکتاپەرستی:

لەسەردەمی ئەودا بیروباوەڕەکانی هاوەڵدانان بۆ خوا لە شێوەی جۆربەجۆردا بڵاوبووبوەوە، وەك پیرۆز ڕاگرتنی گۆڕەکان[389] و پاڕانەوە لێیا ن و پەرستنیان تا ئەوەی کڕنووشیان بۆ گۆڕەکە دەبرد.[390]

ئەمەش بەرهەمی بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی سۆفیگەرایی بوو لەو سەردەمەیەدا کە زۆربەی نێوەندەکانی وڵاتیان گرتبوویەوەو زانایان و دەسەڵاتدارانێکی زۆری موسڵمانانیش پشتگیرییان دەکردن.[391]

لەبەرامبەر ئەمەدا پەرستشی گۆڕەکان وایلێکردبوون پەرستشە شەرعیەکانیان پشتگوێ خستبوو و بەبێ نێوەند لە خوا نەدەپاڕانەوەو مزگەوت و نوێژیان لە نزای شێخەکانیان لا کەمتربوو.[392]

---

[388] – عبدالعظیم: س.پ، ل٣١–٣٥.
[389] – أبوزهرة: س.پ، ل٥٥.
[390] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٨٤.
[391] – ابوزهرة: س.پ، ل٥٥.
[392] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٨٦.





حاڵی ئوممەت گەشتبوویە ئەوەی کەسەکان دەبرانە ئاستی خوایەتی، یان ئەگەر زۆر نەڕۆشتنایە لە پێغەمبەرایەتی یان سەروو پێغەمبەرایەتیدا دایاندەنان، وەك بڕواکەی ئیبن عەرەبی کە پێی وابوو کۆتای پێغەمبەران و کۆتای پیاوچاکانیش هەیە، کۆتای پیاوچاکان لە کۆتای پێغەمبەران باشترە، چونکە پێغەمبەر لە ڕێی جبریلەوە شارەزای پەیامی خوا دەبێت، بەڵام پیاوچاك ڕاستەوخۆ دەچێتە کۆگای سروشەوە.[393]

بۆ نەهێشتنی ئەم چەوتیانەش چەند شێوە هەنگاوێکی گرتەبەر، وەك نووسین و گوفتار کە بەڕوونی ئەوەی دەخستەڕوو پەنابردن و پاڕانەوە لە جگە لە خوا دروست نیە، ئایا ئەو جگە لەخوایە مرۆڤ بێت یان نازیندووبێت یان مردوو، پێغەمبەر بێت یان پیاو چاك...هتد.[394]

تەنها شتێك لە تاکی زیندوو داوا دەکرێت، دەبێت لە پێناوە دنیاییەکان نەچێتەدەر، سەر نزاگاکانیش بۆ پاڕانەوە یان پیرۆزی یان لێخۆشبوون...هتد دروست نییە.[395]

---

[393] – سالم: س.پ، ل٦٧.
[394] – القرني: س.پ، ل٥٢.
[395] – ابن تیمیة: مجموع الفتاوی، ج١، ل١٠٣، ١٥٢، ١٦٨.

ئەو ڕێبازەی ئیبن تەیمییە لەو هەوڵەیدا گرتبوویەبەر، ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە كە دەفەرموێت ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ (٩٤) (*).

- ڕەخنە گرتنی لە فەلسەفەو كەلام و مەنتیق بە نووسین و گوفتار:

بۆ ئەم بوارە لە دوولاوە هەنگاوی دەنا:

١- ڕەخنەگرتن لە فەلسەفە گەرو مەنتیقیەكان و ئەهلی كەلامی جیهانی دەرەوە.[396]

٢- ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەگەراو مەنتیقیەكان و ئەهلی كەلامی ناو جیهانی ئیسلامی وەك غەزالی و ئیبن عەرەبی و...هتد،[397] چونكە هەریەكە و لایەنێكیان وەرگرتبوو، غەزالی دژی فەلسەفە وەستا، بەڵام كاریگەری مەنتیق و كەلام و فەلسەفەش لەسەری دیاربوون.[398]

(*) – سورة الحجر، آية٩٤.

396 – أبوزهرة: س.پ، ل١٩١-١٩٢.

397 – حلمي: قواعد المنهج السلفى فى الفكر الإسلامي، ط٣، دار ابن الجوزي، (القاهرة:٢٠٠٥م)، ل١٧٧-١٨.

398 – سالم: س.پ، ل١٣٧.





بەڵام هەڵوێستی بەرامبەر بە غەزالی لەوانیتر جیاواز بوو و بە دیدێكی ڕێزەوە قسەی لەسەر دەكردو شایەتی بۆ دەدات كە لە چەند بوارێكدا ڕۆڵی زۆر چاكی بۆ موسڵمانان هەبووەو لە كۆتاییەكانی تەمەنیشیدا گەڕاوەتەوە بۆ وەرگرتنی فەرموودە.[399]

فەلسەفەی یۆنانی بەهۆی مەیدانی وەرگێڕانی پێشتر و تێكەڵبون و پێكدادانە ژیاریەكانەوە هاتبویە ناو جیهانی ئیسلامی و لەگەڵ بوونی بەرپەرچدانەوەی زانایانی ئیسلامدا، بەڵام دواجار خۆی سەپاندو كەسانی وەك ئیبن سینا سەرسامی خۆیان بۆ ئەرستۆ زۆر لە فارابی زیاتر بوو.[400]

ئیبن تەیمیە لە نووسینەكانیدا جەختی لەوە دەكردەوە بەرنامەی قورئان لە بەڵگەخوازیدا چاكترین ڕێبازە، بە نووسینە فرەلایەنەكانی وەك (در، تعارض العقل والنقل) یان(الرد على الفلاسفة)و (نقض المنطق)و(الرد على المنطقيين) هەوڵی بەرگریكردن لە بیروباوەڕو هزری ئیسلامی دەدا،[401] ئەو تەنها ڕەخنەی لە فەلسەفەی یۆنان نەدەگرت، بەڵكوو ڕەخنەكانی ئاڕاستەی هەموو هزری فەلسەفە بوو.[402]

399 – حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٧٩-١٨١.

400 – الندوي: س.پ، ج٢، ل٦٠٥-٦٠٩.

401 – سالم: س.پ، ل٢٢-٢٣.

402 – حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل٢٥١.

ئەو پێی وابوو پێویستە ئەو زانستانە شارەزابێت تا بتوانێت لایەنە باش و خراپەكانی هەڵبسەنگێنێت و بڕیاریان لەسەربدات،[٤٠٣]

خاڵێك كە ئیبن تەیمیە جەختی لەسەر دەكردەوە پشت نەبەستن بوو بە شوێنكەوتەیی تێڕوانینە عەقڵیەكان، چونكە ئەوانە زادەی هزری مرۆڤن، بیری مرۆڤیش لە گۆڕاندایە، بۆیە پێوانەكردنیان لە پەیڕەوو دواكەوتنیان باشترە.[٤٠٤]

- وەڵامدانەوەی ئایین و مەزهەب و تاقمە لادەرەكان:

هەوڵی نوێگەری لەم مەیدانەدا لای ئیبن تەیمە بەسەر دوولایەنی سەرەكیدا دابەشدەبێت:

أ- ئایینەكانی جگە لە ئیسلام: لێرەدا هەوڵی دەدا سەرەتاو بنەڕەتی ئایینەكان بخاتەڕوو، پاشان ڕێڕەوی مێژوویی ئایینەكە و ئەو گۆڕانانەی بەسەریدا هاتبوون دەیهێنان، دواتر لادان و هەڵەكانی ئەو ئایینەی دەخستە بەرچاو تا لەلایەكەوە پاراستنی موسڵمانان بێت لێیان و لەلایەكی تریشەوە بانگەوازكردنی ئەوان بێت،[٤٠٥]

[٤٠٣] – أبوزهرة: س.پ، ل١٩١.

[٤٠٤] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٦٣٤.

[٤٠٥] – عبدالعظیم: س.پ، ل٤١-٤٤.







ب- مەزهەب و ڕێڕەوە لادەرەكانی ناو موسڵمانان: ئەمانەش لە ژمارەدا زۆرن و هەریەكەو بە دیدی ئیبن تەیمیە بە ڕێژەیەك لە ڕێبازی قورئان و سوننەت لایانداوە وەك جوهەمیەوموعتەزیلەو قەدەریەو...هتد،[٤٠٦] بۆنمونە:

١- شیعە: ئەمانە لەلایەن ئیبن تەیمیەوە سەختترین هێرشیان دەكرێتەسەر و دەكەونەبەر ڕەخنەی توند،[٤٠٧] چونكە قسەكردنی ئەوان لەسەر بنەڕەتی هاتنی ئیسلامە، ئایا چەند لە هاوەڵان و هەڵگرانی یەكەمی ئیسلام ڕاستگۆبوون؟ قسە لەسەر ناڕاستی هاوەڵانی وەك ئەبووبەكرو عومەرو عوسمان و ئەبوهورەیرەو بەرائی كوڕی عازب و دایكی باوەڕداران عائیشەو...هتد دەكەن، بۆیە ئیبن تەیمییە ڕەخنەیان لێدەگرێت و حوكمی توندیان لەسەر دەدات، دیارترین نووسینیشی لەمبارەیەوە بریتیە لە كتێبی(منهاج السنة النبوية).[٤٠٨]

[٤٠٦] – القرنی: س.پ، ل٤٨-٥٤.

[٤٠٧] – عبدالعظیم: س.پ، ل٦٠.

[٤٠٨] – بروانة ابن تیمیة: منهاج السنة النبویة، ط١، مؤسسة قرطبة، ج١، ل٢٦، ج٣، ل٣٢، ج٨، ل ٤٠٨.

٢-سۆفیگەراكان: ئەمانەش لەبەر ئەوەی شێخەكانیان دەبەردە ئاستێكی سەروو مرۆڤەكان و وەك خودا سەیریاندەكرن یان بە لایەنی كەمەوە هێمای هاوئاستی پێغەمبەرانیان پێدەدان، مرۆڤەكانیان لە پەرستشی خواوە بۆ پەرستشی مرۆڤ و گۆڕەكان دەبرد.[٤٠٩] لەسەدەكانی حەوتەم و هەشتەمیشدا زۆر زاڵ و بلاوبوون، بۆیە ئیبن تەیمییە لە زۆربەی نووسینەكانیدا بە چاوێكی ڕەخنەوە قسەیان لەسەر دەكات.

ئەو سۆفیەكان بۆ سێ قۆناغ دابەش دەكات:

- ئەوانەی لەسەر بیروڕای دروست و پیاوچاك بون، وەك ئیمامی جونەید و عەبدولقادری گەیلانی و ...هتد.
- ئەوانەی لە ڕاستی ئیسلام لایانداوە، وەك حەللاج و ئیبن عەرەبی.
- ئەوانەی سۆفیگەراییان كردووە بە پیشەی بەدەستهێنانی سامان.[٤١٠]

٣-موعتەزیلە: ئەمانە جەختكردنەوەیان لەسەر عەقڵ بوو و دەیانوت با عەقڵ پێش قورئان و فەرموودە بكەوێت و ببێتە پێوەر

[٤٠٩] الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٨٣-٥٨٤.

[٤١٠] - الدوسري: س.پ، ل٢٣٦-٢٤٢.







و عەقڵ، لە ڕەخنە گرتندا لە ئاستی تاكەكاندا نەدەوەستان و تا هەڵگرانی یەكەمیش دەچوون، ئیبن تەیمیەش هەوڵیدا لەڕووی هزریاندا ڕاوەستێت، دیارترین نووسینیشی لەو بارەیەوەكتێبی (درء تعارض العقل والنقل)ە.[٤١١]

- نوێگەری زانستە شەرعیەكان و زیندووكردنەوەی هزری ئیسلامی:

ئیبن تەیمیە بۆ زیندووكردنەوەی هزری ئیسلامی و زانستە شەرعیەكان، هەنگاوێكی گرنگی نا كە ئەویش لێدوان بوو لەسەر ئەو بابەتانەی بە پێویستی دەزانین و دووبارەنەكردنەوەی ئەوانەش بوو كەپێشینان ئەنجامیانداوە، بۆ نموونە تەفسیرێكی گشتی یان كتێبێكی گشتی لەسەر فیقە نیە، بەڵكوو جەختیدەكردەوە لەسەر گرفتە ڕیشەییەكانی ئەوكات كە پێویستیان بە چارەسەرێكی نوێ بوو لە هەمان كۆگای دەرمانەوە كە قورئان و سوننەتە.[٤١٢]

زۆرترین قسەكانی ئیبن تەیمیە لەسەر ئوصول بوو، چونكە زانستە ئیسلامیەكان لەو ڕۆژگارەدا پێویستی زۆریان بە چالاكبوونەوەی ئوصول بوو تا هزری ئیسلامی لە چوارچێوەی خۆیدا بپارێزن.[٤١٣]

[٤١١] - القرني: س.پ، ل٥٠.

[٤١٢] - هـ.س، ل١٠٩-١١٠.

[٤١٣] - البزار: س.پ، ل٥٨٢.

## چاكسازی كۆمەڵایەتی:

لەم بوارەدا ئیبن تەیمیە تێكەڵ بە كۆمەڵگە دەبوو، هەوڵیدەدا دەروونی خەڵك بخوێنێتەوەو چینە جیاجیاكانی كۆمەڵگە بناسێت، لەسەر هەژاران شیعرێكی هەیە كە دەڵێت:

واللە ما فقرنا اختیار     وانما فقرنا اضطرار<br>
جماعة كلنا كسالی     واكلنا ما له عبار<br>
تسمع منا اذا اجتمعنا     حقیقة كلها فشار[٤١٤]

هەروەها چەوتیەكانی ناو كۆمەڵگەی لەناودەبرد وەك شكاندنی بتەكانی سەردەم و ڕێگری لە گۆڕپەرستی و گێڕانەوەی نەریتە كۆمەڵایەتیەكان بۆ تەرازووی شەریعەت.[٤١٥]

مافی چەساوەكانی داوا دەكرد، لەمەشدا جیاكاری ئایینی و نەتەوەیی و چینایەتی نەدەكرد، كاتێك چوویە لای مەغۆلەكان بۆ ئازادكردنی بەندكراوە موسڵمانەكان، بەمەرجی دانا ناموسڵمانە بەندكراوەكانیش ئازاد بكەن و مەرجەكەشی جێبەجێ كرا.[٤١٦]

٤١٤ –الحسامی: س.پ، ل٧٩.

٤١٥ – الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٧٦-٤٧٧.

٤١٦ – ابن تیمیة: مجموع الفتاوی، ط٣، دارالوفاء، (القاهرة-٢٠٠٥م)، ج٢٨، ل٦١٧.







بۆ مافی یەك كەسیش دەچوویە لای سوڵتان و لە بەرامبەریدا ڕادەوەستا و داوای مافی دەكرد،[٤١٧] لە بەخششی سامانیشدا بەخشەندە بوو.[٤١٨]

چاكسازی سیاسی: هەوڵی چاكسازی ئیبن تەیمیە لەم بوارەدا لە دوو لایەنەوە خۆی نواندووە، یەكەمیان نووسین و تۆمارێكی هەزری مەیدانی سیاسیە كە خۆی دەبینێتەوە لە نووسینی كتێبی(السیاسة الشرعیة في إصلاح الراعي والرعیة) و نووسینەكانی دیكەی لە بواری سیاسەتدا تا ببنە بنەڕەتێك بۆ چاكسازی هەزری سیاسی،[٤١٩] دووەمیش مەیدانی پەیڕەوی چاكسازی سیاسی بوو، بۆ نموونە دەچوویە كۆشكەكانی مەغۆل و مەمالیك و هەوڵی چاكسازی هەركامیانی دەدا،[٤٢٠] بە ئاماژەی ئەو بوو كە سەركردەیەكی ستەم كاری ناو شام لەلایەن سولتانی مەملووكیەوە لابرا، یان جێگری دیمەشق گوازرایەوە.[٤٢١]

٤١٧ – الصفدی: س.پ، ج٧، ل١٢.

٤١٨ – البزار: س.پ، ل٦٠١.

٤١٩ – آنتوني بلك: تأریخ أندیشه سیاسی إسلام، ترجمه: محمد حسین وقار، چ٢، انتشارات إطلاعات، تهران:٢٠٠٧م)، ص٢٤٧-٢٥٥.

٤٢٠ – الحسامي: س.ث، ل١٧٥، ١٩٢.

٤٢١ – ابن كثیر: س.پ، ج١٤، ل٦٣.

هەوڵی ئیبن تەیمیەش بوو سوڵتانی مەملوکی بەرەو جەنگی مەغۆلەکان برد،[٤٢٢] غازانی دایە بەر نەشتەری ڕەخنە،[٤٢٣] بەرامبەر بە ستەمی جاشنگیری مەملووکی هەڵوێستی نواند، دوای هەموو هەوڵەکانیشی وتی:"من پیاوی گەلم نەوەك دەوڵەت".[٤٢٤]

٤٢٢ – الندوي: س.پ، ج٢، ل٤٧١.

٤٢٣ – القطان: س.پ، ل٤٥-٤٦.

٤٢٤ – الحسامي: س.پ، ل٣٣٨-٣٣٩.







## باسی سێیەم

## (کاریگەری هزری ئیبن تەیمیە لە مێژووی ئیسلامیدا)

لەگەڵ ئەوەی ئیبن تەیمیە لەبەندیخانەدا گیانی سپاردو نووسینەکانیشی کۆنەکرابوونەوە و نەیارانێکیشی هەبوون، بەڵام بە مردنی ڕێبازو هەوڵە چاکسازییەکەی کۆتایی پێنەهات و کاریگەری هزری تا ئەمڕۆ لە بوارە جیاجیاکاندا لەبەرچاوە، چونکە هەوادارانێکی زۆری لەدوای مردنی کەوتنە گرنگیدان بە نووسینەکانی.[٤٢٥]

خوێندکارەکانی ئیبن تەیمیە دووجۆر بوون، جۆریکیان ئەوانە بوون کە لەوانە گشتیەکاندا ئامادەبوون، جۆریکی تریان ئەوانەی وانەی تایبەتیان لێوەرگرتووە، ئەمانە لەدوای مردنی کەوتنە گرنگیدان و گەشەدان بە هزری.[٤٢٦]

گرنگترینی ئەو کەسانەش ئیبن قەیمی جەوزییە کە لەسەر دەستی ئیبن تەیمیە زانستی وەرگرت و لەبوارە جیاجیاکاندا شارەزایی پەیداکرد،[٤٢٧] دوای مردنی ئیبن تەیمیە، ئەم هەستا بە

٤٢٥ – أبوزهرة: س.پ، ل٤١٨-٤٢٤.

٤٢٦ – هـ.س، ل٤١٨-٤١٩.

٤٢٧ – الندوي: س.پ، ج٢، ل٧١٩-٧٢٠.

پێشکەشکردنی سامانێکی گەورەی زانستی  کە پوختەی هزری ئیبن تەیمیەی مامۆستای بوو.[428]

یەکێك لەو لایەنانەی کە ئیبن تەیمیە ئیشی لەسەر کردبوو، چاکسازی کۆمەڵایەتی و چارەی نەخۆشییە دەروونیەکان بوو، ئیبن قەیمیش گرنگیەکی زۆری بەو بوارە دا تا ئەوەی چەندین نووسینی لەو بارەوە جێهێشت و تیایدا قسەی لەسەر دیارترین گرفت و نەخۆشیە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان کردووە، بۆنموونە لە کتێبی(الجواب الكافى  لمن سأل عن الدواء الشافي) دا بە وردی قسە لەسەر کێشەی خۆشەویستی دەکات، بە تایبەت ئەو خۆشەویستیەی کە لە نێوان کچ و کوڕدا هەیەو دەبێە هۆی ئازارو دڵەڕاوکێی هەردوولا، ئەوپێش هەموو شتێك هیوابەخشی بەبوونی چارەسەردەدات و هۆکارو سیفەت و تایبەتمەندی و دەرەنجامەکانی خۆشەویستی ڕای خۆی لەسەر دەردەبڕێت.[429]

لەپێناو ڕێبازە چاکسازیەکەی ئیبن تەیمیەی مامۆستایدا ئازار دراوە، بەڵام خۆڕاگر بووەو دەستبەردار نەبووە.[430]

[428] – القطان: س.پ، ل٧٨-٧٩.

[429] – مجموعة باحث: علم النفس فى التراث الأسلامي، ط١، دار السلام، (القاهرة/٢٠٠٦م)، ج٣، ص١١٥٥-١٢٢٥.

[430] - الشوكانى: س.پ، ج٢٣، ل٦٩٦.







لەبارەی دەستە لادەرەکانیش، لە ڕوویاندا دەوەستێت و کتێبی وەك(اجتماع الجيوش الاسلامية  على غزو المعطلة والجهمية) دەنوسێت،[431] لایەنی سیاسی ئیسلامیش لەبیر ناکات وکتێبی (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية) ی نووسیوە، نووسنەکانی ئەم لەوەدا لەوانەی مامۆستاکەی جیاوازبوون کە هێمنی و لەسەرخۆییان پێوە دیاربوو.[432]

یەکێکی تر لە خوێندکارەکانی ئیبنو عەبدولهادی مەقدسی بوو کە زانایەکی زۆر گەورەو دیاری مێژووی ئیسلامیەو هەوڵیداوە هزری ئیبن تەیمیە بەرەو پێش ببات و چەند نووسینێکیشی هەیە، کاتێك ئیبنو سەبی کتێبێك لە وەڵامدانەوەی ڕای ئیبن تەیمیە سەبارەت بە سەردانی گۆڕ دەنوسێت، ئیبنو عەبدولهادی بەرامبەر بەوە کتێب دەنووسێت بە ناوی(الصارم المنكر في الرد على السبكي) و تیایدا بەرگری لە ئیبن تەیمیە دەکات.[433]

ئیبن کەثیری دیمەشقیش خوێندکارێکی تری ئیبن تەیمیە بوو، لە نووسینەکانی و تەفسیرەکەیدا بەڕوونی گرتنەبەری ڕێبازی ئیبن تەیمیە دیارە، هەروەها شەمسەدینی زەهەبیش هەوڵێکی زۆری

[431] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٧٣٧.

[432] – أبوزهرة: س.پ، ل٤٢٠.

[433] – الندوي: س.پ، ج٢، ل٧٣٧.

خستەگەڕو نووسینەکانی لە زۆریو بەهێزیو تایبەتمەندیدا کەموێنەن، لەپێناو بیروباوەڕی ئیبن تەیمیەو بزووتنەوە چاکسازیەکەیدا ئازاری چەشتووە.[٤٣٤]

دوای ئەمانە ئەو کەسایەتیە دیارەی هەوڵی ڕۆیشتن بە ڕێڕەوی ئیبن تەیمیەو خوێندکارەکانی دەدات، ئیبنو ڕەجەبی جەنبەلیە کە چەند نووسینێکی هەیەو بەشێوەیەکی تەواو لە نووسینەکانیدا گیانی چاکسازی و بانگخوازی ئیبنولقەیم بەدیدەکرێت و ئەویش هەمان ڕێبازی سەلەفیەتی ئەوانی گرتوەتەبەر.[٤٣٥]

پاشان چەند کەسایەتییەکی تر هەبوون ئەگەر چی ڕاستەوخۆ خوێندکاری ئیبن تەیمیە یان خوێندکاری خوێنکارەکانی نەبوون، بەڵام لە نووسین و هەوڵەکانیاندا هەمان ڕەوتیان گرتوەتەبەر، لەوانە ئەبو ئیسحاقی شاطبی لە کتێبی (الموافقات) یان کتێبی (الاعتصام)دا هەمان زنجیرە چاکسازیەکەی ئیبن تەیمیەی داوەتەبەر.[٤٣٦]

٤٣٤ – شلش: س.پ، ل٤٨.

٤٣٥ – القطان: س.پ، ل٨٥.

٤٣٦ – الندوي: س.پ، ج٢، ل٧٤٥.







بەڵام دواتر ڕەوتی خوێندنگەی ئیبن تەیمیە بە هاتنی سەردەمی عوسمانی و داخرانەوەی دەرگای ئیجتیهاد و پشتبەستن بەنووسینەکانی پێشترو کورتکراوەکان و گەشەسەندنەوەی بیری سۆفیگەرایی و لادانەکان لاوازبوو.[٤٣٧]

کۆتا کەسێك هەوڵی بوژاندنەوەی هزری ئیبن تەیمیەی دا، موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بوو کەلەحیجازدا سەریهەڵدا و لەسەرەتاوە دەستیدایە خوێندنەوەی نووسینەکانی ئیبن تەیمیەو بە گەورەیی سەیری دەکردن و بەتەواوەتی کەوتە ژێر کاریگەریانەوەو هەوڵیدا ئەو هزرە ببوژێنێتەوە و لەناو خەڵکدا بلاویبکاتەوە.[٤٣٨]

موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب بۆ چەسپاندنی هزری ئیبن تەیمیە، توانی سوود لە دەسەڵاتی سعود وەبگرێت کە ئەویش کەسایەتیەکی دەسەڵاتدارو ئاینی ناوچەکە بوو، بەوجۆرە موحەممەد توانی بە هزری ئیبن تەیمیەو شمشێری سعود دەوڵەتێکی سەلەفی دابمەزرێنێت و دەوڵەتەکەش بە شێوەیەکی زۆر دیار لەسەر هزرو تێڕامان و نووسینەکانی ئیبن تەیمیە وەستا بوو.[٤٣٩]

٤٣٧ – الزهراني: س.پ، ج٢، ل ٨٥، ٢٤٣، ٢٧١، ٤٣٧، ٥٤٦.

٤٣٨ – القطان: س.پ، ل٨٦–٨٧.

٤٣٩ – أحمد الطحان: حتمية التغيير، ط١، دار المعرفة، (بيروت/ )، ص٣٠٩.

ئەم دەوڵەتە ڕووی لە فراوانخوازی كردوو خەریكبوو دەسەلاتی خۆی بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوەستێنێت،[440] بەڵام لەلایەن موحەممەد عەلی پاشای میسرەوە هێرشی كرایەسەر و بزووتنەوەی وەهابیەت گورزێكی توندی بەركەوت و بەرەو لاوازی چوو،[441] تا لەدوای مردنی موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب چەقبەستویی و سنورداری سیاسی و هزری ڕوویكردە بزووتنەوەكەی.[442]

سەدەی نۆزدەو بیستەم بەتایبەت سەردەمی گەشانەوەی هزری خوێندنگەی ئیبن تەیمیە بوو، كە سانی وەك موحەممەد ڕەشید ڕەزاو چەندێكیتر هەوڵی گەشەسەندنەوەی هزری ئیبن تەیمیەیان دا،[443] بزووتنەوەی سەنوسی لە ئەفریقا لە ژێر كاریگەری هەمان هیزردا سەریهەڵداو هزری ئیبن تەیمیەی وەرگرتبوو،[444] بەمجۆرە زۆر لە سۆفیگەرایی باوی سەردەمی عوسمانی جیاواز بوو و بەدووربوو لەلادانە ئاینییەكان.[445]

[440] – الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، و: أحمد عبدالرحمن أحمد و نهاد جلال حبیب الله، چ١، دارالمعرفة، (بیروت:٢٠٠٧ز، ل ٤٦٣-٤٦٦.
[441] – هـ. س: ل ٤٦٧-٤٧٢.
[442] – أبوزهرة: س.پ، ل٤٢٣.
[443] – الطحان: س.پ، ل٣٠٩.
[444] – القطان: س.پ، ص٨٧.
[445] – الندوة العالمیة للشباب الإسلامی: الموسوعة المیسرةفي الأدیان والمذاهب و الأحزاب المعاصرة، ط٥، دارالندوة العالمیة، (الریاض:٢٠٠٣م)، ج١، ص٢٨٨.







هەروەها بزووتنەوەی مەهدییە لە سودان سەریهەڵدا كە ئەمیش بە هەمانشێوە لە ژێر كاریگەری هزری ئیبن تەیمیەدا بوو و لە گەشەسەندنی ئەو هزرەدا ڕۆڵێكی دیاری بینی،[446] ئەم بزووتنەوە لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا ڕۆڵی خۆی بینی و تا ئەمڕۆش ماوەو ڕۆڵی خۆی هەیە.[447]

پاشان بزووتنەوەی ئیخوان موسلیمین هات تا ئاستێك لە ژێر كاریگەری هەمان هزری ئیبن تەیمیەدا بوو،[448] ئەو تێڕامان و خەسڵەتانەی حەسەن بەننا هەیبوو، لە چەند لایەنێكەوە لەگەڵ بزووتنەوە چاكسازیەكەی ئیبن تەیمیەدا یەكیدەگرێتەوە، تا هەتا سەر كەسایەتی دیاری ناو ئیخوان موسلیمین كە سەید قوتبە، سەید قوتب دژ بە ڕەوشی نالەباری سەردەمەكەی هەستاو هەوڵیدا گۆڕان و چاكسازی ڕیشەیی ناو كۆمەڵگەكەی لە بوارە جیاجیانەوە بەجێبگەیەنێت، بەتایبەت جەختكردنەوەی زۆری لەسەر لایەنی بیروباوەڕی بوو.[449]

[446] – القطان: س.پ، ل٨٧.
[447] – الندوة العالمیة للشباب الإسلامی: س.پ، ج١، ل٣١٠.
[448] – القطان: س.پ، ل٨٧.
[449] – الطحان: س.پ، ل٣٠٩-٣٢٢.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا دەسەڵاتی سعوودی بەردەوام گرنگی بە ڕەوتی وەهابی سەلەفی خۆی دەداو نوسینەکانی ئیبن تەیمیەو خوێندکارەکانی و موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابیش تیایدا بڵاوبوون و تا ئەمڕۆش ئەو ڕەوتە لە شانشینی سعودیەدا بڵاوە.[450]

[450] – أبوزهرة: س.پ، ل٤٢٣-٤٢٤.







## باسی چوارەم

## (لێکدانەوەی ئیبن تەیمیە بۆ مێژوو)

ئیبن تەیمیە وەك بوارەکانی تری زانستەکان، لە دیدی قورئان و سوننەت و پاشان ڕای سەلەفەوە سەیری مێژووی دەکردو خوێندنەوەی بۆ ژیان و مێژووی بوون و ڕێکردەی مێژوویی مرۆڤەکان هەبوو،[451] هەر لەم ڕوانگەشەوە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە بۆ دروستکردنی ئادەم و حەوا، ئەمەش لە ڕوانگەی ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی فەرموودەو، بەمە هزرێکی ئیسلامی دوور لە کاریگەری بیانی هەیە.[452]

ئەو باس لەسەرەتای ململانێی مرۆڤ و بەرەوڕووبوونەوەی تاقیکردنەوەکان دەکات، مرۆڤ دەخاتە قاڵبی بەردەم دووڕیانی چاکەو خراپە، شەیتان دەبێتە دوژمنی مرۆڤ و بڕیاردەدات مرۆڤەکان بەرەو چەوتی ببات، لەمەشدا دەرفەتی خودایی ڕێپێدەریەتی نەوەك تواناو هاوهێزی خودی شەیتان، فریشتەکانیش ڕۆڵی فرمانبینی دەبینن نەوەك هەڵوێست نواندن واتە لە خوداوە بڕیار وەردەگرن چی بکەن و چی نەکەن و بە

[451] – الكرمي: س.پ، ل٣٤٩.

[452] – محمد جلال شرف: الله والعالم والإنسان ڤ الفكر الإسلامي، دار النهضة العربيه، بيروت، ص٣٥٣.

ویست وبیری خۆیان دەستوەرنادەنە ڕەوڕەوەی مێژووی مرۆڤایەتی.[٤٥٣]

ئیبن تەیمیە پێی وایە مێژووی مرۆڤایەتی مێژووی پێغەمبەرەكانەو ئەگەر ئەو پێكهاتەیە لە مێژوو دابماڵین هیچ واتایەك بۆ مێژوو نامێنێتەوە، بەڵكو پێغەمبەران مێژووی مرۆڤایەتیان گرتوەتە دەست و سەركەوتن و نوشوستیەكانی مێژووی مرۆڤیش بە ئاستی پەیوەستبوون و لادانیان لە ڕەوتی ڕێنیشاندەری پێغەمبەرانەوە بەستراوەو هەركات لەڕێنموونی و ڕێنماییەكانی پێغەمبەران لایاندابێت، ئەوا چەرمەسەری و سەختی ڕوویكردوەتە ئەو كەس و گەلانە،[٤٥٤] نموونەی ئەمەش نەوەی ئیسرائیلە كە ناوو ناوبانگی مێژوییان لە قورئاندا بە كوشتاری پێغەمبەران و ڕێگری پەیامی خواو لادان لەڕێنمایی پێغەمبەران هاتووە.[٤٥٥]

ئەو پێی وایە مرۆڤایەتی هەمیشە پەیوەست بوون بە بوونی پێغەمبەرانەوەو مێژووش بە بێ ئەوان ڕێ نابڕێت، بۆیە لە هەموو سەردەمەكانی مێژووی مرۆڤایەتیدا پێغەمبەران بەدیكراون و لە

[٤٥٣] – ابن تیمیة: مجموعة الفتاوی، ج١، ل٨٢، ج٢، ل١٤٧-١٥٢، ج٣، ل٣٢٤، ج٤، ل٢٦٤.
[٤٥٤] – حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٨٩.
[٤٥٥] – ابن تیمیة: مجموعة الفتاوی، ج٢٨، ل ٦٠٦.





و ئەو سەردەمەشدا وەك كەسایەتی یەكەم بەرچاو دەكەون،ئەركی مرۆڤەكان لە مێژوودا بەجێگەیاندنی فرمانی خوایە، پێغەمبەرانیش نێوەندی نێوان خواو مرۆڤەكانن تا پەیامی خوایان پێبگەیەنن.[٤٥٦]

پاشان بەراوردی نێوان پێغەمبەران و فەیلەسوفان دەكات و پێی وایە فەیلەسوفان هاتون تا ڕێی ڕاست لە مرۆڤەكان ئاڵۆز بكەن و پێچی و سەختی بێننە بەردەم مرۆڤەكان، بەڵام پێغەمبەران هاتون بە ڕوونی و ساكاری ڕێگەی ڕوونیان نیشانی مرۆڤایەتی داوە، بەمە فەیلەسووفەكان ڕۆڵی زیانبەخش و پێغەمبەرانیش ڕۆڵی سوودبەخش و چاكسازی دەبینن.

گەل و كۆمەڵەكانیش بەسەر دوودەستەدا دابەشدەكات:

١- كۆمەڵێك ئەوانەن كە ئایینی ئاسمانییان بۆهاتووە، ئەمانە هەڵگری پەیامی خوایی بون،[٤٥٧] بەڵام دەستێوەردانە مرۆییەكان و سەركەشی ولادانیان لەپەیامێكی خوا وایكردووە بەدوای هەر پەیامێكدا پەیامێكی تر بێت تا نوێگەری و گۆڕانی چاكسازی بەپەیامی پێشوو بدات، بەڵام لەمەبەستی گەیاندندا هەموویان یەك مەبەست وئامانجیان هەبووە كە ئەویش بریتیە لە یەكتاپەرستی، بۆیە هیچ پەیامێك پێچەوانەی پەیامی پێشووی خۆی نیە.[٤٥٨]

[٤٥٦] – حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٨٩-١٩٠.
[٤٥٧] – ه.س، ل١٨٨.
[٤٥٨] – ابن تیمیة: مجموعة الفتاوی، ج١، ل٢-٣، ٣٥٧، ج٥، ل٢٣٩.

پاشان قسە لەسەر مێژووی ئەو ئایینانە دەکات و ڕۆڵی دەستێوەردانی مرۆڤەکان لە ئایینەکان دەخاتەڕوو، بۆنموونە ئەو کارە چەوت و لاسارییانەی جولەکە لە ئایینی مووسادا ئەنجامیاندا، یان گۆڕینی ئایینی مەسیح لەلایەن شوێنکەوتوانی دواتری ئایینی مەسیحیەتەوە، ئەمەش لە کتێبی(الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح)دا ڕوونکراوەتەوە.[459]

٢- ئەوانەی ئاینی ئاسمانییان بۆ نەهاتوتە خوارەوەو خاون پەیامی خودایی نین،[460] سەرچاوەی هەموو تێڕامانی ئەمانە خودی مرۆڤەکانن، بۆیە ئیشکردنی سەرەکییان لەسەر عەقڵی مرۆڤە، وەك فەیلەسوفە یۆنانیەکان، ئەو پێی وایە ئەمانە لێڵی و قورسایییان بە ڕێڕەوی چوون بەرەو حەقیقەت داوەو پێغەمبەرانیش هاتوون تا بەرامبەر بەوە ڕێڕەوی ڕاست و ڕوون و ساکار بخەنە پێشچاو.[461]

هەروەها پێی وایە مرۆڤەکان تووشی نەخۆشی بون، بۆ ئەمەش دوو دەستە قسەیان لەسەر نەخۆشیەکە کردووە، فەیلەسوفەکان هاتون قسەیان لەسەر هۆکارو شێوەو لایەنەکانی نەخۆشیەکە کردووە لە کاتێکدا نەخۆشەکە بەرەومەرگ دەچێت و

[459] - أبوزهرة: س.پ، ل٤١٠-٤١١.

[460] - حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٨٨.

[461] - شرف: س.پ، ل٤٥٥-٤٦٦.





ئەوانەش دادی نادەن، پێغەمبەرانیش هاتون لەگەڵ ئەوەی ئەو شتانەیان زانیوە، بەڵام قسەیان لەسەر نەکردووە و ڕاستەوخۆ چارەسەرەکانیان خستوەتەکار، بەمە تووشبوانی نەخۆشیەکە ڕزگاریانبووە، لێرەدا نەخۆشەکان ئەگەر فەیلەسوفان هەڵبژێرن لەئاست چارەسەردا دەستەوسان دەوەستن، ئەگەریش پێغەمبەران هەڵبژێرن چارەسەیان دەستدەکەوێت.

بە شێوەیەکی گشتی دیدی ئیبن تەیمیە بۆ مێژوو تێڕوانینێکی ئایینیەو لە چوارچێوەی ئایینە یەکتاپەرستیەکاندایەو بە هاتنی هەر ئایینێکی نوێی یەکتاپەرستی دەستەبەرداری کارابوونی ئایینی پێشوو بووە، بەمجۆرە پێی وایە تێڕوانینی ئیسلام بۆ مێژوو تاکە تێڕوانینی دروستە.[462]

[462] - حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٨٨-١٩٠.

## تێڕوانینی بۆ مێژووی ئیسلامی:

ئـیبن تەیمیـە سـەردەمی پێغەمبـەر (ﷺ) و دواتـر سـەردەمی خەلیفەكانی ڕاشیدین دەكاتە بناغەی ڕێڕەوی مێژووی ئیسلامی و زۆر جەخت لـەو فـەرموودە دەكاتـەوە كە دەفەرموێت:(خير الناس قرني ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم...)،[٤٦٣] لەسەر بنەمای ئەم فەرموودەیە پێی وایە مێژووی ئیسلامی تا لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دووربكەوێتـەوە هەڵـەو لادانـی زیـاتری تێدەكـەوێت، لەگـەڵ ئەمەشدا ڕای خۆی بەڕەشبینانە ناهێڵێتەوەو فەرموودەیەك دەكاتە بەڵگە بۆ هیوابەخشین بە موسڵمانان (إن الله يبعث إلى هذه الأمة على رأس كل مائة سنة من يجدد لها دينها)،[٤٦٤] بەپێی ئـەم فەرموودەیـە ئوممـەتی ئیـسلامی بـەرەو هـەر هەڵـدێرێك بـڕۆن، لەهـەموو سـەدەیەك ڕەوتەكـەیان لەسـەر دەسـتی نوێگـەرێك دەچێتەوە ڕەوڕەوەی ڕاستی جارانی خۆی.[٤٦٥]

هـەروەها پێـی وایـە قـسەكردن لەسـەر كەسـایەتی پێغەمبـەر (ﷺ)بە خراپە، بەزاندنی سنوری خواو لێدانی موسڵمانانە، بەڵكو مێژووی پێغەمبەر(ﷺ) مێژوویەكی دروست و بناغەو پێشەنگی

---

[٤٦٣] - متفق عليه.

[٤٦٤] - رواه أبوداود، رقم الحديث٤٢٩١.

[٤٦٥] - حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٧٢، ١٩٢.





پێوەركردنی ئـەركی سەرشـانی موسـڵمانانە،[٤٦٦] بـە پێـی ئـەو ئایەتـەی دەفـەرموێت:﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأَخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾.[*]

هـاوەڵانیش كەسـانی دەوری پێغەمبـەرو نموونـەی بـاڵای مرۆڤایـەتین، ڕای بەرامبـەر بـەكارو كـردەوەی هـاوەڵان هـەمان ڕای ئـەهلی سـوننەو جەماعەیـە و پێـی وایـە دادوەرو ڕاسـتن، قسەكردنیش لە ڕوویاندا یان بەكەمدانانیان تاوانەو پێویستە وەك سەرمەشق سەیربكرێن.[٤٦٧]

پاشان قسە لەسەر فیتنەی گەورەی كوژرانی عوسمانی كوڕی عەففان و حوسـەینی كـوڕی عـەلی[٤٦٨] و فیتنـەی جـەنگی جەمـەل و صەفین دەكات،[٤٦٩] پێی وایە گەورەترین چەرمەسەریەك دووچاری مێـژووی موسـڵمانان بووبێـت، بریتیـە لـە كـوژرانی عوسمـان و حوسەین كە دووهاوەڵی دیاری پێغەمبەرن (ﷺ).[٤٧٠]

---

[٤٦٦] - ابن تيمية: الصارم المسلول على شاتم الرسول، ط١، دار ابن حزم، (بيروت:١٤١٧هـ)، ل٢، ٢٦، ٣٠، ٤٥-٤٦، ٢١٩.

[*] - سورة الأحزاب، آية٢١.

[٤٦٧] - حلمي: نظام الخلافة فى الفكر الأسلامي، ل٤١٢.

[٤٦٨] - ابن تيمية: مجموعة الفتاوى، ج٤، ل٥١٠، ج٢٥، ل٣٠٣.

[٤٦٩] - الدوسري: س.پ، ل٢٢٩.

[٤٧٠] - حلمي: نظام الخلافة فى الفكر الأسلامي، ل٤٣٠-٤٣٢.

جگە لەوەی تاوانی هەڵەی جەنگی جەمەل و صەفین دەداتەوە پاڵ نەیارانی ئیسلام و بەشداربوانی جەنگەکە لەو ئاستەدا دادەنێت کە ئیجتهادیان کردووە، ئەوەی لە ئیجتهادەکەدا پێکاویەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبەو دووپاداشتی بۆ هەیە، ئەوانی تریش لە ئیجتهاددا نەیانپێکاوەو یەك پاداشتیان بۆ هەیە.[٤٧١]

دیدی ئیبن تەیمیە بۆ دەستەو تاقمەکانی ناو ئیسلام دیدێکی ڕەخنەگرانەو نەیارانەیە، ئەو بە ڕووی بەڵگەو بیانووەکانی خەواریج و شیعەو موعتەزیلە و ...هتد.دا دەوەستێت،[٤٧٢] بۆ نموونە بەرامبەر بە شیعە گومانی لە بنەڕەتیان هەیەو بە دەستی جوولەکەیان دەزانێت.[٤٧٣]

سەبارەت بە سۆفیگەرایی سێ قۆناغیان بۆ دادەنێت:

١- قۆناغی کەسانی وەك حەسەنی بەصری و عەبدولقادلاری گەیلانی و جونەید و ...هتد، ئەمانە لە خزمەتکردنی ئیسلام و موسڵماناندا جێدەستیان دیارە.

٢- قۆناغی ئەوانەی تێکەڵ بە فەلسەفەو لادانەکان بوون وەك حەللاج و سەهرەوەردی و ئیبن عەرەبی، ئەمانە زیانبەخش بون.

٤٧١ – هـ.س، ل٤٣١-٤٣٢.
٤٧٢ – القرني: س.پ، ل٤٦-٥٣.
٤٧٣ – الزهراني: س.پ، ج١، ل٢٧٦.







٣- ئەوانەی سۆفیگەراییان کردووە بە پێناوێك بۆ بەدەستهێنانی دارایی.[٤٧٤]

لایەنێکی دیاری مێژووی ئیسلامی بریتیە لە مێژووی بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئیبن تەیمیە لە کتێبی (منهاج السنة النبوية) یدا بە وردەکاریەوە قسەی لەسەر دەکات و پێی وایە بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ)بە جیا لەهەموان مافی زیاتریان هەیەو هەر ستەمێکیشیان لێکرابێت دەبێت پێی ناڕازی بن، تێڕوانینێکی خۆشەویستی و بەرگریکردنی بۆ عەلی کوڕی ئەبووتالیب و فاتیمەو حەسەن و حوسەین هەیە و بەرپەرچی دەستەی دژایەتیکەری خەواریج و دەستەی زیادەڕەویکەری شیعە لە بارەیانەوە دەداتەوە.[٤٧٥]

ئەو بە هێزی بیروباوەڕی دروستی ئیسلامی دەکاتە بنەمای بە هێزی مێژووی ئیسلامی، پێی وایە لەو کاتەوەی بیروباوەڕی پتەوی ئیسلامی لە بەهێزی ڕازیکردنی عەقڵی و دڵنیایی دڵەوە بوو بەچەند بیرو هزرێکی وشکی لێدوان لە بوونی خودایی، شانوشکۆی دڵەکان نەماو بە کوژاندنەوەی بیروباوەڕو تاودانە بواری مشتومڕی کەلام و فەلسەفەو سەرهەڵدانی بیدعە لەناو موسڵماناندا، مێژووی ئیسلامی بەرەو لاوازی چووەو لە

٤٧٤ – الدوسری: س.پ، ل٢٣٥-٢٤١.
٤٧٥ – ابن تيمية: منهاج السنة النبوية، ج١، ل٣٠، ج٢، ل٢٥-٢٦، ٣٧، ١٤٢.

دەرەنجامی ئەوەدا دەرفەت کراوەتەوە تا خاچییەکان هێرش بکەنە سەر جیهانی ئیسلامی و لەکۆتاییەکانی سەدەی چوارەمدا بەیتولمەقدیس بگرن.[٤٧٦]

ئیبن تەیمیە پێی وایە سەرهەڵدانی دەستەو مەزهەبەکانی ناو ئیسلام لە دەرەنجامی لادانیان بووە لە قورئان و سوننەت، ئەمەش زیانی بە مێژووی ئیسلامی گەیاندووە، بۆ ئەمەش دەبێت لە ڕوویاندا بوەستن، بۆیە چەندین وەڵامدانەوەو نووسینی ڕەخنەگرانەی لە مەزهەب و تاقمە جیاجیاکانی وەك خەواریج و شیعەو سۆفی و موعتەزیلەو جوهمیەو قەدەریە هەیە.[٤٧٧]

بەمجۆرە ئیبن تەیمیە بنەڕەتی مێژووی ئیسلامی بە بنەڕەتێکی بەتین و نێوەندەکەشی بە ماوەیەکی ئیجابی تێکەڵ بە هەڵەو سەردەمی لاوازیشی بە ماوەی دوورکەوتنەوە لە قورئان و سوننەت و پێشەنگی پێغەمبەرو هاوەڵان دەزانێت و گەشبینیش بەرامبەر بە داهاتووی موسڵمانان دەدات کە لەوپەڕی لاداندا هەموو سەدساڵ جارێك کەسێك دەبێتە پێشەنگی موسڵمانان تا بیانگێڕێتەوە سەر ڕەوتی جارانی.[٤٧٨]

---

[٤٧٦] – حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٩٠.

[٤٧٧] – القرني: س.پ، ل٤٦–٥٣.

[٤٧٨] – حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٩٠–١٩١.







# باسی پێنجەم

## (ئیبن تەیمیە لەنێوان هەوادارا ن و نەیارانیدا)

ڕاجیاوازی و بەشبوونێکی زۆر لەسەر کەسایەتی ئیبن تەیمیە هەیە و ململانێیەکی سەخت لەنێوان هەواداران و نەیارانیدا بەدیدەکرێت.

گرنگترین تێڕوانینەکان بەرامبەر بە ئیبن تەیمیە خۆی لە سێ خاڵدا دەبینێتەوە:

١. هەوادارانێکی ئیبن تەیمیە کە زیادەڕەوی لە ئاستیدا دەنوێنن، بەڵکو وای لێدەکەن لە ئاستی زانایەتی دەریدەکەن و ئامادە نین لە قسەی ئەو زیاتر وەربگرن، یان دان بە هەر هەڵەیەکیدا بنێن.[٤٧٩]

٢. نەیارانی ئیبن تەیمیە: ئەمانەش دان بە هیچ چاکەیەکی ئەو کەسایەتیەدا نانێن و بە توندی قسەی لە ڕوودا دەکەن و بە کەسایەتیەکی خراپی دەزانن، بەڵکو دەیگەیەننە ئاستی ئەوەی کەسی وایان هەبێت پێی بڵێت (بەندەیەکە خوا سەرشۆڕ و گومڕا و کەڕ و زەبوونی کردووە).[٤٨٠]

---

[٤٧٩]– الشوكاني: س.پ، ج١، ل٩٤.

[٤٨٠]– الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٥٩.

٣. کەسانێك به چاوێکی مامناوەندی بۆی دەڕوانن و چاکە و خراپەکانی لەبەرچاو دەگرن، هەرچەندە نەیانتوانیبێت بێلایەنی خۆیان بپارێزن، بەڵام تا ئاستێك لایەنە باش و خراپەکانیشی لەبەرچاو دەگرن،[٤٨١] ئەم دابەشبوونەش بۆ کەسایەتی ئیبن تەیمیە شتێکی ئاساییە، چونکە هەمیشە کەسایەتییە گەورەکان کە ڕۆڵی دیاریان لە ژیانی خەڵك و مێژووی مرۆڤایەتیدا هەیە، دەکەونە بەر دابەشبوونی دوو لایەنی هەواداری و نەیارانەوە و هەرکامە و هەوڵ دەدەن ڕای خۆیان بەسەر ئەویتردا بسەپێنن، هەر ئەم ڕا جیاوازیە هێمای گەورەیی ئەو کەسایەتیانەیە، بۆیە دەتوانین بڵێین بوونی ڕای جیاوازیش لەسەر ئیبن تەیمیە بەڵگەی گەورەیی ئەو کەسایەتییەیە.[٤٨٢]

ئەوانەی نەیاری ئیبن تەیمیەن هەریەکە و لەبەر هۆکارێك یان چەند هۆکارێك ئەو هەڵوێستەیان وەرگرتووە، لەوانەش:

١- فیقهناسان و کەسایەتیەکانی سەردەمی خۆی، لەبەرئەوەی دەمارگیری مەزهەبی لەنێوانیاندا هەبوو و ئامادەنەبوون ڕای مەزهەبی تر وەربگرن، وەك چۆن دەبینین ئیبن

[٤٨١]- صائب: س.پ، ل٩-١٢.

[٤٨٢]- الندوي: س.پ، ج٢، ل٥٤٧-٥٤٨.





مەخلوفی حەنەفی ڕکەبەرێکی توندی ئیبن تەیمیەیە[٤٨٣]، یان ئامادەنەبوون ئیجتیهاد بکرێتەوە، بەڵام ئیبن تەیمیە ئەو دەرگایەی کردەوە و کۆمەڵێك ڕای خستەڕوو کە لە مەزهەبەکانی تردا نەبوون یان لەوانە جیاواز بوون، وەك فەتوادانی لەبارەی کەوتنی سێ تەڵاق بەجارێك، ئەمە وایکرد ببێتە مایەی بەندکرنی و دژایەتی زانایانێك لە ڕوویدا.[٤٨٤]

٢- کەسانێك ئێرەییان بە کەسایەتیەکەی دەبرد، بۆیە دژایەتییان دەکرد، چونکە کاتێك دەیانبینی ئیبن تەیمیە لەناو جەماوەردا هەوادارانێکی زۆری هەیە و خەڵك بە پیریەوە دەچن، لەناو حکومەتیشدا ڕێزی بۆ دادەنرێت و گوێی لێدەگیرێت، ترسیان لەوە بوو جێپێی خۆیان لەدەستبدەن، بۆیە دژایەتیان لە ڕووەدا نواند.[٤٨٥]

٣- لەناو دەسەڵاتدا کەسانێکی وەك جاشنگیر هەبوون کە نەیاری ئیبن تەیمیە بوون، ئەمانە لە لایەن نەیارانی ئیبن تەیمیەوە هاندەدران تا دژایەتی بکەن، بۆ ئەمەش

[٤٨٣]- النویری: س.پ، مج١٥، ج٣٢، ل٨١

[٤٨٤]- ابن عبدالوهاب: س.پ، ل٢١٠

[٤٨٥]- الندوی: س.پ، ل٥٤٩.

گومانیان لەلا دروست دەکرا، وەك ئەوەی جاشنگیر وا تێگەیەنرابوو بوونی ئیبن تەیمیە بەو شێوازە مایەی مەترسیە بۆ سەر دەسەلآتەکەی،[٤٨٦] یان سوڵتان ناسر کە هەواداری ئیبن تەیمیە بوو لە لایەن زانایانێکەوە وایلێکرا[٤٨٧] بڕیاری بەندکردنی بدات و تا مردنیشی لە بەندیخانەدا بیهێڵێتەوە.

٤- سۆفیەکانیش بە شێوازێکی زۆر سەخت دژایەتی ئیبن تەیمیەیان دەکرد، ئەمەش لەبەرئەوەی ئیبن تەیمیە لە ڕوانینە چاکسازیەکەیدا بە دیدێکی ڕەخنەییەوە سەیری چەند لایەنێکی سۆفیگەرایی دەکرد،[٤٨٨] بە تایبەت لە مەسەلەی ئیبن عەرەبی و نوسینەکانیدا کە بە توندی بەرپەرچی ڕاکانی ئیبن عەرەبی دایەوە،[٤٨٩] بەرپەرچدانەوەکەشی لەبەر ئارەزوویەکی دەروونی نەبوو، بەڵکو هەوڵێکی ڕەخنەگری زانستی بوو،[٤٩٠] ئەو لە سەرەتاوە بە ئیبن عەرەبی سەرسام بوو، بەلاّم کە چەند

---

[٤٨٦] – الحسامي: س.پ، ل٣١٢-٣١٣

[٤٨٧] –أبو زهرة: س.پ، ل٧٢.

[٤٨٨] –حلمي: قواعد المنهج السلفي، ل١٧٢-١٨١

[٤٨٩] = سالم: س.پ، ل١٠٢-١٠٣.

[٤٩٠] – الندوی: س.پ، ج٢، ل٥٥٤





نوسینێکی تری خوێندەوە و بە لادان لە شەریعەتی دانان، ئەوکات هەڵوێستی ڕەخنەگری گرتەبەر،[٤٩١] لەو کاتەشدا ڕەخنەگرتن لە ئیبن عەرەبی لای زۆرێك تاوانێك بوو کە لێخۆشبوونی بۆ نەبوو، بەڵکو دەبوو لەسەر ئەوە توندترین سزا بدرایە،[٤٩٢] لەو کەسانەش کە زۆر پەیوەست بە ئیبن عەرەبی بوون نەسری مونبەجی بوو کە لەسەر ئەوە نێوانیان تێکچوو و هەوڵیدا پلان لە دژی ئیبن تەیمیە بگێڕێت تائەوەی ڕایکێشایە دادگای میسر.[٤٩٣]

٥- شیعەکانیش نەیارانێکی زورسەر سەختی ئیبن تەیمیەن، چونکە ئەو بە توندی بەرپەرچی ڕاو مەزهەبی شیعە دەداتەوە و نووسینی وەك (منهاج السنة النبوية) یان لەڕوودا دەنووسێت و بە لادان لە ئیسلام پێناسیسان دەکات.[٤٩٤]

٦- کەسانێك نووسینەکانی ئیبن تەیمیەیان بەردەست نەکەوتووە، یان تەنها چەند نووسینێکیان بەردەستکەوتووە، یان کۆمەڵێك نووسینیان

---

[٤٩١] – هـ.س، ج٢، ل٤٨٥

[٤٩٢] – هـ.س، ج٢، ل٥٥٣

[٤٩٣] – الحسامي: س.پ، ل٣٠٩-٣١٠

[٤٩٤] – عبدالعظيم: س.پ، ل٦٠-٦١

بەردەستکەوتووە کە دەستکاری کراون و ساختەیان تێدا ئەنجامدراوە، بۆیە هەڵوێستی دژایەتییان لەڕوودا نواندووە، بۆ نموونە ئیبن حەجەری هەیتەمی هەندێك شتی لەسەر ئیبن تەیمیە خوێندەوە کە هی ئەو نین و دراونەتە پاڵی، لەسەر ئەمەش ئالوسی نوسینێکی هەیە بە ناوی (جلاء العينين بمحاكمة الأحمدين) تیایدا بە وردەکاریەوە ئەوە دەخاتەڕوو کە زۆر شت هەن دراونەتە پاڵ ئیبن تەیمیە و لە بنەڕەتدا هی ئەو نین و هەیتەمیش لەو ڕوانگەوە لە دژی بڕیاریداوە.[٤٩٥]

٧- یان نموونەی ئەو هەڵبەستەی کە ئیبن بەتووتەی گەشتیار لە سەفەرنامەکەیدا بەرامبەر بە ئیبن تیمیە نووسیوویەتی وتۆمەتی لادان لە بیروباوەڕی داوەتە پاڵ و دەڵێت: "لە دیمەشق یەکێك لە گەورە فیقهناسەکانی حەنبەلی تەقیەدین ئیبن تەیمیە بوو کە عەقڵی جۆرە نوقسانیەکی تێدا بوو، خەڵکی دیمەشقیش بە گەورەیان رادەگرت،...من لە دیمەشق بووم لە نوێژی هەینی لای ئیبن تەیمیە ئامادەبووم کە لەسەر مینبەری مزگەوت ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد و لە وتەکانیدا وتی: خوا وەك دابەزینی من

---

[٤٩٥]- الآلوسي: س.پ، ج١، ل١٨-٢٠.







لەم پلیکانانەی مینبەردا دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا، ئەو کات دابەزی و فیقهناسێکی مالیکی بەناوی ئیبن زەهراء لەڕوویدا وەستا و خەڵکیش دایانە پاڵ ئەو و بە دست و نەعل زۆریان لە ئیبن تەیمیەدا تا مێزەرەکەی سەری کەوتە خوارەوە و ئاوریشمێکی لە ژێردا بوو دەرکەوت، خەڵکیش لەسەر ئەوە لۆمەیان کرد و بردیان بۆ ماڵی عیززەدینی کوڕی موسلیمی دادوەری حەنبەلیەکان و ئەویش دوای ئەوە فرمانی گرتنی دەرکرد".[٤٩٦]

بەڵام لە چەند لایەکەوە ئەو تۆمەتە دەکەوێتە بەر دیدی ڕەخنەییەوە:

- ئەو بە نوقسانی عەقڵی دەزانێت، بەڵام دەڵێت خەڵکی بە گەورە رایاندەگرت.[٤٩٧]
- ئیبن بەتووتە لە ڕۆژی پێنج شەممە ٩ ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی(٧٢٦ك/١٣٤٤ز) گەیشتۆتە دیمەشق[٤٩٨]، بەڵام ئیبن تەیمیە لە ڕۆژی دوو شەممە ٦ ی مانگی شەعبانی ساڵی(٧٢٦ك/١٣٤٤ز) بەند کراوە و تا مردنی لە ساڵی(٧٢٨ك/١٣٤٦ز) لەوێ ئازاد نەکراوە.[٤٩٩]

---

[٤٩٦]- ابن بطوطة: رحلة ابن بطوطة، ط٤، دارالكتب العلمية، (بيروت-٢٠٠٧م)، ص١١٣.

[٤٩٧]- القطان: ص١٤٨

[٤٩٨] - ابن بطوطة: س.پ، ١٠٤

[٤٩٩] - الجزري: س.پ، ج٢، ل٣٠٩.

- ئیبن تەیمیە لە مینبەردا ئامۆژگاری خەڵکی نەدەکرد، بەڵکو هەمیشە لەسەر کورسییەك دادەنیشت.
- ئەو کاتەی ئیبن بەتووتە چوویە دیمەشق دادوەری دادوەران جەلالەدینی موحەممەدی کوڕی عەبدورەحمانی قەزوینی وتاربێژی مزگەونی دیمەشق بوو.
- ئیبن تەیمیە لە هەموو نوسینەکانیدا دژ بەو تۆمەتەیە کە ئیبن بەتوتە لەڕوویدا نوسیویەتی و ئەگەر بڕوانینە نوسینەکانی پێچەوانەی ئەوە دەبینین[٥٠٠]

٨-وەستانی لەڕووی چەند لێکدانەوەیەکی ئەشعەریدا کە خەڵکی پێیان وابوو ڕای ئەهلی سوننەیە و بەشێکە لە بیروباوەڕی ئیسلامی و لادان لەوە تاوانێکی گەورەیە، ئەوان وایاندەزانی ئیبن تەیمیە پێشەوانەی ئەهلی سوننە و زانایان و شەریعەت دەڵێت[٥٠١].

٩-هەندێك لەبەر ئەوە دژایەتی ئیبن تەیمیە دەکەن، چونکە شوێنکەوتەی زانایان کەسایەتیەکن و تەواو خۆیان داوەتە دەست ڕا و ڕوانینی ئەو کەسە، ئەویش نەیاری ئیبن تەیمیەیە، ئەو کەسانەش لە پێشڕەوەکەیانەوە ئەو هەڵوێستە وەردەگرن[٥٠٢].

---

[٥٠٠]- القطان: س.پ، ل١٥٤-١٥٩

[٥٠١]- الندوی: س.پ، ج٢، ل٥٥٢.

[٥٠٢]- عبدالعظیم: س.پ، ل١٩٢







بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئیبن تەیمیە کەسایەتیەکە گەورەی وابوو کە بوویە مایەی سەرلەنوێ بوژاندنەوەی هزر و زانستی ئیسلامی و بوو بە بنەڕەتێك بۆ هەوڵەکانی دواتر، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك شتی هەن کە دەکرێت وەرنەگیرێن و ڕای جیاواز لەوانە هەبێت، یان چەند سیفاتێکی ناباشی هەبوون وەك ئەوەی زەهەبی خوێندکاری لەگەڵ سەرسامبوونی پێی، توندی لێکۆڵینەوەو تووڕەیی و توندی لەڕووی نەیاران و مانەوەی ڕق و کینە لەدڵیدا دەکاتە ڕەخنە لەسەری.[٥٠٣]

---

[٥٠٣] - الشوکانی: س.پ، ج٢، ل٩٤-٩٥.

# دەرەنجام

١. سەدەکانی حەوتەمو هەشتەمی کۆچی سەردەمی ئاڵۆزی فرەلایەنەی مێژووی ئیسلامی بوو و شاڵاوی سەربازی مەغۆڵو خاچپەرستیو ململانێی ناوخۆییو دابەشبوونی مەزهەبیو چەقبەستوویی هزریو گرفتە ئابوورییەکان ڕوویان لە جیهانی ئیسلامی کردبوو.

٢. چەند سەرکردەو زانایەك هەوڵی چاکسازی ئەو ڕەوشەی جیهانی ئیسلامییاندا، وەك قوتزو بیبرس یان نەوەویو عیززی کوڕی عەبدوسەلام، بەڵام دیارترین زانای چاکسازی ئەو سەردەمە ئیبن تەیمیەیە.

٣. ئیبن تەیمیە زانایەکی کوردەو ژیانی بە زانستخوازی بردوەتەسەرو هەوڵی چاکسازیو گۆڕانی داوەو لەو پێناوەشدا ناڕەحەتیو ئازاری چەشتووە، بەڵام خۆڕاگر بووەو تا مردنی وازینەهێناوە.

٤. بەندکردنەکانی ئیبن تەیمیە لەبەر چەند هۆکارێکی هەوڵی چاکسازی ئەو و ترسی فرەلایەنەی بەرامبەرەکانی ڕوویاندا، هەروەها ماوەیەك لە بەندیخانەکانی میسرو دواتریش شامدا بەندکرا، مردنیشی لە بەندیخانەیەکی دیمەشقدا بوو.

٥. ئیبن تەیمیە لە مێژووی ئیسلامیدا ڕۆڵێکی دیاری هەبووەو توانیویەتی لە لایەنی جیهادیەوە دوای قوتز و بیبرس







دیارترین ڕۆڵ ببینێت، لە ڕووی زانستیشەوە گۆڕانێکی گەورەی کردو کتێبخانەی ئیسلامی دەوڵەمەند کرد.

٦. کاریگەری ئیبن تەیمیە لە دوای خۆی مایەوەو تا ئەمرۆش خوێندنگەیەکی گەورەی ناو جیهانی ئیسلامی پێکهێناوە.

٧. ئەو لە دیدێکی ڕەهای ئایینیەوە دەڕوانێتە مێژووی مرۆڤایەتیو پێغەمبەران بە سەرمەشقی ئەو مێژووە دەزانێت، بۆ مێژووی ئیسلامیش سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان (رضي الله عنهم) بە بناغەی ئەو مێژووە دەزانێتو پێی وایە بەرەبەرە هەڵەو لادانی تێکەوتووە، بەڵام لە هەموو سەدەیەکدا چاکسازێك هەبووە تا ڕەوشەکە بگێڕێتەوە بۆ سەر ڕێی جارانی یان لادانەکان بخاتە بەرچاو.

٨. ڕەوتی هەواداری و نەیاری بەرامبەر بە کەسایەتی ئیبن تەیمیە هەبوون و تائەمرۆش ماون، ئەمەش ئاماژەیە بە گەورەیی ڕۆڵو کاریگەری ئەو کەسایەتییە.

# سەرچاوەکان

القرآن الكريم

## یەکەم: سەرچاوە عەرەبییەکان

### أ: سەرچاوە سەرەکییەکان:


-الآلوسی، أبی البرکات خیرالدین نعمان بن محمود أفندي (ت١٣١٧هـ/ ١٨٩٩م).

١- جلاء العینین بمحاکمة الأحمدین، تحقیق: ابن منیر، ط١، المکتبة العصریة، (بیروت -٢٠٠٦م).

-ابن الأثیر، عزالدین ابی الحسن علي بن محمد بن محمد(ت٦٣٠هـ/١٢٣٢م).

٢- الکامل في التأریخ، تحقیق: د.عبدالسلام التدمري، دار الکتاب العربي، (بیروت- ٢٠٠٦م).

الأربلی: شرف الدین بن أبي البرکات المبارك بن أحمد

٣- تأریخ أربل، تحقیق: سامي بن سید خماعد الصقار، وزارة الثقافة والإعلام، (بغداد-١٩٨٠م).

ابن بطوطة: أبوعبدالله محمد بن عبدالله الطنجي (ت٧٧٩هـ/١٣٧٧م).

٤- رحلة ابن بطوطة، ط٤، دارالکتب العلمیة، (بیروت- ٢٠٠٧م).

البزار: سراج الدین أبی حفص عمر بن علي بن موسی (ت٧٤٩هـ/ ١٣٤٨م).









٥- الأعلام العلیة في مناقب ابن تیمیة، علق علیه: د.یحیی مراد، ط١، دار الکتب العلمیة، (بیروت -٢٠٠٥م).

ابن تغري بردي: جمال الدین أبی المحاسن یوسف، (ت٨٧٤هـ/١٤٧٠م).

٦- النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، وزارة الثقافة والأرشاد القومي، مصر

ابن تیمیة: شیخ الأسلام أحمد بن عبدالحلیم (ت٧٢٨هـ/١٣٢٨م).

٧- الصارم المسلول علی شاتم الرسول، ط١، دار ابن حزم، (بیروت:١٤١٧هـ).

٨- مجموعة الفتاوی، تحقیق: أنوز الباز و عامر الجزار، ط٣، دارالوفاء، (القاهرة-٢٠٠٥م).

٩- منهاج السنة النبویة، تحقیق: د.محمد رشاد سالم، ط١، مؤسسة القرطبة.

١٠- درء تعارض العقل والنقل، تحقیق: د.محمد رشاد سالم، دار الکنوز الأدبیة، (الریاض-١٣٩١هـ).

ابن الجزري: شمس الدین عبدالله محمد بن أبراهیم بن ابی بکر (ت٧٣٨هـ/ ١٣٣٧م).

١١- تأریخ حوادث الزمان و أنبائه و وفیات الأکابر والأعیان من أبنائه، المکتبة العصریة، (بیروت-٢٠٠٦م).

ابن حجر: شهاب الدين أحمد بن علي العسقلاني (ت٨٥٢هـ/١٤٤٨م).

١٢- الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، مجلس دائرة المعارف العثمانية، الطبعة الثانية، (حيدرأباد – ١٩٧٢م).

الحنبلى:شهاب الدين أبى الفلاح عبدالرحمن بن احمد بن محمد (ت١٠٨٩هـ/١٦٧٨م).

١٣- شذرات الذهب في اخبار من ذهب، تحقيق: مصطفى عبدالقادر عطا، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت-١٩٩٨م).

ابن خلدون: أبوزيد عبدالرحمن بن محمد(ت٨٠٨هـ/١٤٠٥م).

١٤- كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر، ط٢، دارالكتب العلمية، (بيروت-٢٠٠٣م).

ابن خلكان: أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد (ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).

١٥- وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق: أحسان عباس، ط١، دار صادر، بيروت.

الذهبي: شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان (ت٧٤٨هـ/١٣٧٤م).

١٦- تأريخ الأسلام، تحقيق: عمر عبد السلام التدمري، ط١، دار الكتاب العربي، بيروت -١٩٨٧م).





١٧- تذكرة الحفاظ، دار الكتب العلمية، بيروت.

١٨- سير أعلام النبلاء، تحقيق: شعيب الأرناؤط و محمد نعيم، ط٩، مؤسسة الرسالة، (بيروت-١٤١٣هـ).

١٩- العبر فى خبر من غبر، تحقيق: د.صلاح الدين المنجد، ط٢، مطبعة حكومة الكويت، (كويت-١٩٨٤م).

٢٠- معجم محدثي الذهبي، تحقيق:د.روحية عبدالرحمن، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت:١٩٩٣م).

ابن رجب: زين الدين أبي الفرج عبدالرحمن بن أحمد (ت٧٩٥هـ/١٣٩٢م).

٢١- الذيل على طبقات الحنابلة، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٧م).

السيوطي ٩١١: جلال الدين عبدالرحمن بن أبى بكر (ت٩١١هـ:١٩٠٥م).

٢٢- تأريخ الخلفاء، تحقيق: أحمد أبراهيم و سعيد بن أحمد، دار الكتاب العربي، (بيروت:٢٠٠٦م).

٢٣- طبقات الحفاظ، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت:١٤٠٣هـ).

أبوشامة: شهاب الدين عبدالرحمن بن أسماعيل بن أبراهيم (ت٦٦٥هـ/١٢٦٦م).

٢٤- كتاب الروضتين فى أخبار الدولتين النورية والصلاحية، علق عليه: ابراهيم شمس الدين، ط١، داراالكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٢م).

الشهرستاني: أبو الفتح محمد بن عبدالكريم بن أبي بكر أحمد (ت٥٤٨هـ/١١٥٣م).

٢٥- الملل و النحل، تحقيق: أمير علي مهنا و علي حسن فاعور، ط٨، دار المعرفة، (بيروت:٢٠٠١م).

الشوكاني: محمد بن علي بن محمد (ت١٢٥٠هـ/١٧٥٣م).

٢٦- البدر الطاع بمحاسن من بعد القرن السابع، تحقيق: محمد حسين حلاق، ط١، دار ابن كثير، (بيروت:٢٠٠٦م).

الصفدي: صلاح الدين خليل بن أيبك (ت٧٦٤هـ/١٣٦٣م).

٢٧- الوافي بالوفيات، تحقيق: أحمد الأرناؤوط و تركى مصطفى، دار أحياء التراث، (بيروت:٢٠٠٠م).

صفي الدين: محمد بن أحمد البخاري (ت١٢٠٠ك/١٧٨٦ز)

٢٨- القول الجلي في ترجمة شيخ الأسلام تقي الدين ابن تيمية الحنبلي، علق عليه: د.يحيى مراد، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت -٢٠٠٥م).

ابن عبدالوهاب: أبى عبدالله محمد بن أحمد (ت٧٤٤هـ/١٣٤٣م).







٢٩- العقود الدرية قى مناقب شيخ الأسلام ابن تيمية، اعتنى به: محمد حسن أسماعيل، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت -٢٠٠٥م).

أبوالفداء: عمادالدين إسماعيل بن محمد بن عمر (ت٧٣٢هـ/١٣٣١م).

٣٠- المختصر في أخبار البشر، علق عليه: محمود ديوب، ط١، داراالكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٧م).

القلقشندي: أبوالعباس علي بن أحمد (ت٨٢١هـ/١٤١٨م).

٣١- صبح الأعشى في صناعة الأنشا، ط١، دار الفكر، دمشق:١٩٨٧م).

القنوجي: صديق بن حسن (ت١٣٠٧هـ/١٨٨٩م).

٣٢- الحطة في ذكر الصحاح الستة، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت-١٩٨٥م).

ابن قيم الجوزية: محمد بن أبي بكر أيوب الزرعي(ت٧٥١ك-١٣٥٠ز).

٣٣- الوابل الصيب، تحقيق: محمد عبدالرحمن عوض، ط١، دار الكتاب العربي، (بيروت:١٩٨٥م).

٣٤- مؤلفات ابن تيمية، ط١، دار الكتاب العربي، (بيروت:١٩٨٥م).

٣٥- الصواعق المرسلة، تحقيق: د.علي بن محمد، ط٣، دار العاصمة، الرياض:١٩٩٨م).

٣٦- مدارج السالكين، تحقيق: محمد حامد، ط٢، دار الكتاب العربي، بيروت:١٩٧٣م).

٣٧- مفتاح دارالسعادة، دارالكتب العلمية، بيروت.

الكتبي: محمد بن شاكر بن أحمد بن عبدالرحمن (ت٧٦٤هـ/١٣٦٣م).

٣٨- فوات الوفيات، تحقيق: علي محمد و عادل أحمد، ط١، دارالكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٠م).

ابن كثير: عمادالدين أبوالفداء أسماعيل (ت٧٧٤هـ/١٣٧٢م).

٣٩- البداية والنهاية، تحقيق: د.حامد أحمد الطاهر، ط١، دار الفجر، (القاهرة:٢٠٠٣م).

الكرمي: مرعي بن يوسف (ت١٠٣٣هـ/١٦٢٤م).

٤٠- الكواكب الدرية في مناقب شيخ الأسلام ابن تيمية، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٥م).

ابن مفلح: برهان الدين أبراهيم بن محمد بن عبدالله (ت ٨٤٤هـ/١٤٧٩م).

٤١- المقصد الأرشد في ذكر أصحاب الأمام أحمد، تحقيق: د.عبدالرحمن بن سليمان، ط١، مكتبة الرشد، (الرياض:١٩٩٠م).

المقريزي: تقي الدين أبي العباس احمد بن علي بن عبدالقادر (ت٨٤٥هـ/١٤٤١م).




ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەکو ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا) نهاد جلال




٤٢- السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق:محمد عبدالقادر عطا، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٧م).

ابن ناصرالدين: محمد بن عبدالله (ت٨٤٢هـ/ ١٤٣٩م).

٤٣- الرد الوافر على من زعم أن ابن تيمية شيخ الاسلام كافر، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٥م).

النعيمي: عبد القادر بن محمد (ت٩٢٧هـ/ ١٥٢١م).

٤٤- الدارس في تاريخ المدارس، تحقيق: إبراهيم شمس الدين، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت:١٤١٠هـ).

النويري: شهاب الدين أحمد بن عبدالوهاب (ت٧٣٣هـ/١٣٣٣م).

٤٥- نهاية الأرب فى فنون الادب، تحقيق: ابراهيم شمس الدين، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٤م).

ابن الوردي: زين الدين عمر بن مظفر (ت٧٤٩هـ/١٣٤٨م).

٤٦- تأريخ ابن الوردي، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٦م).

اليافعي: أبو محمد عبدالله بن أسعد بن علي بن سليمان (ت٧٦٨هـ/١٣٦٦م).

٤٧- مرآة الجنان وعبرة اليقظان، دار الكتاب الأسلامي، (القاهرة:١٩٩٣م).

## ب: مەرجەعەکان


أبوزهرة، محمد:

٤٨- ابن تيمية، دارالفكر العربي، (القاهرة:٢٠٠٠م).

بروى، أدوارد:

٤٩- تـأريخ الحـضارات العـام(القـرون الوسـطى)، اشـراف: موريس كروزيه، عويدات، بيروت.

الحسامي، إسلام بن عيسى

٥٠- سيرة شيخ الإسلام ابن تيمية وحكاياته مع أبناء زمانه، ط١، دار ابن كثير، (عمان-أردن:٢٠٠٦م).

حسن، إبراهيم حسن:

٥١- تـأريخ الإسـلام، ط١٥، دارالجيـل، (بـيروت-القـاهرة- تونس:٢٠٠١م).

حسون، علي:

٥٢- تـأريخ الدولـة العثمانيـة، ط٤، المكتـب الاسـلامي،( بيروت:٢٠٠٢م).

حلمي، مصطفى:

٥٣- قواعد المنهج السلفى فى الفكر الإسلامي، ط٣، دار ابن الجوزي، (القاهرة:٢٠٠٥م).

٥٤- نظـام الخلافـة في الفكـر الإسـلامي، ط١، دارالكتـب العلمية، (بيروت:٢٠٠٤م).

الزهراني، علي بن نجيب:







٥٥- الإنحرافات العقيـدة والعلميـة في القـرنين الثالـث عـشر والرابـع عـشر الهجـريين، ط٢، دار طيبـة، (مكـة المكرمة:١٩٩٨م).

زيتون، عادل:

٥٦- تاريخ المماليك ط٥، جامعة دمشق، دمشق.

الدوسري، عائض بن سعد:

٥٧- هكـذا تحـدث ابـن تيميـة، ط١، المكتـب الإسـلامي، (بيروت-عمان:٢٠٠٧م).

سالم، محمد رشاد:

٥٨- مقارنـة بـين الغزالـي وابـن تيميـة، دار القلـم، (الكويت:١٩٩٢م).

السيلى، سيد عبدالعزيز:

٥٩- العقيدة السلفية بين الإمام ابن حنبل والإمام ابن تيمية، ط١، دار المنار، (القاهرة:١٩٩٣م).

شاكر، محمود:

٦٠- التـأريخ الإسـلامي، ط٤، المكتـب الإسـلامي، (بـيروت- دمشق-عمان:٢٠٠٠م).

شرف، محمد جلال:

٦١- الله والعـالم والإنـسان في الفكـر الإسـلامي، دار النهـضة العربية، بيروت.

شلش، عدنان بن محمد بن عبدالله:

٦٢– شـيخ الإسـلام ابـن تيميـة محـدثا، ط١، دارالنفـائس، (عمان:٢٠٠٥م).

صائب عبدالحميد:

٦٣– ابن تيمية، مطبعة الغدير، بيروت.

الصلابى، علي محمد:

٦٤– الأيوبيـون بعـد صـلاح الـدين، ط١، دارابـن الجـوزي، (القاهرة:٢٠٠٨م).

٦٥– تأريخ دولـتي المـرابطين والموحـدين، ط٢، دارالمعرفة، (بيروت:٢٠٠٥م).

الطحان، أحمد:

٦٦– حتميـة التغـيير فـى الـشرق الأوسـط الكـبير، ط١، دار المعرفة، (بيروت:٢٠٠٦م).

طقوش، محمد سهيل:

٦٧– تـأريخ المماليـك في مـصر وبـلاد الـشام، ط٢، دار النفائس، (بيروت:١٩٩٩م).

٦٨– تـأريخ الدولـة العباسـية، ط٥، دارالنفـائس، (بيروت:٢٠٠٥م).

٦٩– تـأريخ سـلاجقة الـروم في آسـيا الـصغرى، ط١، دار النفائس، (بيروت:٢٠٠٢م).

العبادي، أحمد مختار:







٧٠– في تـأريخ الأيـوبيين والمماليـك، دارالنهـضةالعربية، (بيروت:١٩٩٥م).

عبد العظيم، سعيد:

٧١– منهج شـيخ الإسـلام ابـن تيميـة التجديـدي الـسلفي و دعوته الإصلاحية، ط١، دار العقيدة، (القاهرة:١٩٩٩م).

ابن عثيمين:

٧٢– شـرح العقيـدة الواسـطية، ط١، دار ابـن الهيـثم، (القاهرة/٢٠٠٢م).

العك، خالد عبدالرحمن:

٧٣– الأصول الفكرية للمناهج السلفية عند شيخ الإسلام ابن تيميـة، ط١، المكتـب الإسـلامي، (بـيروت–عمـان– دمشق:١٩٩٥م).

الغصن، عبدالله بن صالح:

٧٤– دعـاوى المنـاوئين لإبـن تيميـة، ط١، دار ابن الجـوزي، (الرياض:١٤٢٤هـ).

قاسم، عبده قاسم:

٧٥– عـصر سـلاطين المماليـك، ط١، دارالـشروق، (القاهرة:١٩٩٤م).

القرني، عائض بن عبدالله

٧٦– علـى سـاحل ابـن تيميـة، ط٤، مكتبـة العبيكـان، (الرياض:٢٠٠٧م).

القطان، احمد و محمد طاهر الزين:

٧٧- شيخ الإسلام أحمد تثقي الدين إبن تيمية، دار الإيمان، (إسكندرية:٢٠٠١م).

القهوجي، محمد رضا بشر:

٧٨- حاضـر العـالم الأسـلامى، ط٢، دارالكلـم الطيـب، (دمشق-بيروت:٢٠٠٤م).

ابن المقفع، ساويرس:

٧٩- تأريخ البطاركة، ط١، مكتبة مدبولى، (القاهرة/٢٠٠٦م).

موسى، محمد يوسف:

٨٠- ابن تيمية، ط٢، العصر الحديث، (بيروت:١٩٨٨م).

الندوة العالمية للشباب الإسلامى:

٨١- الموسـوعة الميـسرةفي الأديـان والمـذاهب و الأحـزاب المعاصـرة، إشـراف و مراجعـة: د.مـانع بـن حمـاد الجهني، ط٥، دارالندوة العالمية، (الرياض:٢٠٠٣م).

الندوي أبو الحسن

٨٢- رجـال الفكـر والـدعوة، ط٣، دار ابـن كـثير، بيروت:٢٠٠٧م).

النهار، عمار محمد:

٨٣- العـصر المفـترى عليـه عـصر المماليـك البحريـة، ط١، دارالنهضة، (دمشق:٢٠٠٧م).

مجموعة باحث:







٨٤- علـم الـنفس فـى الـتراث الأسـلامي، ط١، دار الـسلام، (القاهرة/٢٠٠٦م).

## دووەم: فارسیەكان:

بلك، آنتوني:

٨٥- تأريخ أنديشه سياسى إسلام، ترجمه: محمد حسين وقار، چ٢، انتشارات إطلاعات، (تهران:٢٠٠٧م).

رانسيمان، أستيون:

٨٦- تأريخ جنگهای صليبي، ترجمه: منوچهر كاشف، چ٦، انتشارات علمي و فرهنگى، (تهران:٢٠٠٧م).

## سێیەم: كوردیەكان:

خضرى بك، محمد

٨٧- چـەند وانەيـەك لـە مێـژووى ئيـسلامى، و: نهـاد جـلال حبيب الله، چ١، دارالمعرفة، (بيروت:٢٠٠٨ز).

الصلابى، على محمد محمد:

٨٨- دەوڵەتى عوسمانى، و: أحمد عبدالرحمن أحمد و نهاد جلال حبيب الله، چ١، دارالمعرفة، (بيروت: ٢٠٠٧ز).

الصياد، فؤاد عبدالمعطي:

٨٩- مـەغۆل لـە مێـژوودا، و: نهـاد جـلال، چ١، چـاپخانەى ڕوون، (سلێمانى:٢٠٠٨ز).

# بەرهەمەکانی نووسەر:

## نووسینەکان:

١. ئیبن تەیمیە ( ئەم بەرهەمەی بەردەستە).
٢. ژیانی پێغەمبەر بۆ منداڵان ( چاپکراوە).
٣. ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر بۆ منداڵان و تازەپێگەشتوان (چاپکراوە).
٤. پەیامێك بۆ گەنجان ( ئامادەیە بۆ چاپ).
٥. هەنگاوێك بەرەو هاوسەرگیری (چاپکراوە).
٦. ئیمانناسی(چیرۆك) (چاپکراوە).

## وەرگێڕانەکان:

٧. دەوڵەتی عوسمانی: د.علی محمد الصلابی وەرگێڕانی بە هاوکاری أحمد عبدالرحمان أحمد (چاپکراوە).
٨. مەغۆل لە مێژوودا: د.فؤاد عبدالمعطی الصیاد(چاپکراوە).
٩. دەوڵەتی سەلجووقیەکان: د.علی محمد الصلابی وەرگێڕان بەهاوکاری شاهۆ عومەر عارف( لەژێر چاپدایە).
١٠.چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی: شێخ محمد خضری بك (چاپکراوە).
١١.مێژووی نوێی ئەورووپا: چەند نووسەرێك، وەرگێڕان بە هاوکاری فاررووق محمد محمدأمین ( ئامادەیە بۆ چاپ).



ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەك و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا) ـــــــ نهاد جلال

١٢.بەراوردێك لەنێوان غەزالی و ئیبن تەیمیەدا: د.محمد رشاد سالم ( ئامادەیە بۆ چاپ).
١٣.مێژووی دەوڵەتی عەبباسی: د.محمد سهیل طقوش (لەژێر چاپدایە).
١٤.مێژووی ئەیووبی و مەملووکیەکان: د. أحمد مختار العبادی (لەژێر چاپدایە).
١٥.پوختەی مێژووی ئیسلامی: د.محمد سهیل طقوش (لەژێر چاپدایە).
١٦. جەنگە گەورەکان و فتوحاتە ئیسلامیەکان: محمد سعید موسی (لەژێر چاپدایە).
١٧. پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: پرۆفیسۆر دکتۆر جفری برۆن. (ئامادەیە بۆ چاپ).

پشت بەخوا بەم زوانە چاوەڕوانی ئەم بەرهەمانەش بن:

١٨. دەوڵەتی ئومەوی: پرۆفیسۆر دکتۆر عبدالشافي محمد عبداللطیف
١٩.ژیانی هاوەڵان( چوار بەرگ): محمد یوسف الكاندهلوی.